# مجاهد الدين قايماز

واليی هەولێر و موسڵ
٥٥٩/٥٩٥ کۆچی
١١٦٤/١١٩٩ زایینی

دکتۆر سادق ئەحمەد جۆدە

وەرگێڕان و لێکۆڵینەوە
خەسرەو پیربالْ القصاب

٢٠٢٢

**والیی ئەربل و موسڵ**

**٥٥٩/٥٩٥ کۆچی**
**١١٦٤/١١٩٩ زایینی**

**Mucahidaddin kaimaz**
**Erbil ve Mosul Valisi**

**دکتۆر سادق ئەحمەد داود جۆدە**

**مامۆستای یاریدەدەر**
**لەزانکۆی ئیمام محەممەد بن سعوودی ئیسلامی**
**لە ریاز**

**وەرگێڕان و ئامادەکردن**
**خەسرەو پیربال القصاب**

**هەرێمی کوردستانی عێراق – ٢٠٢٢**

له بڵاوكراوەكانی سەنتەری سوڵتان
موزەفەرەددین گوگبورو بۆ فیكر و مێژوو
انتشارات و حفظ اثار السلطان مظفرالدين گوگبورو
حكومەتی هەرێمی كوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیریی و لاوان
ژمارەی سپاردن: ٢٠٢١/٩٥٥
هەولێر - هەرێمی كوردستان
ژمارەی سپاردنی كتێبی نێودەوڵەتی:
ISBN: 978-952-94-1436-9

ئەم كتێبە لەسەر ئەركی بەڕێز سەرۆكی حكومەتی
هەرێمی كوردستان جەنابی مەسرور بارزانی چاپ كراوە

چاپی یەكەم ٢٠٢٢

| | |
|---|---|
| ناوی كتێب: | موجاهیدەدین قایماز - والیی ئەربل و موسڵ<br>٥٥٩-٥٩٥ی كۆچی ١١٦٤-١١٩٩ی زایینی |
| نووسەر: | دكتۆر صادق احمد داود جودە |
| ئامادەكردن و وەرگێڕان: | خەسرەو پیربال قەساب |
| دیزاین: | شاخەوان جەعفەر خۆشناو |
| دەزگای: | الرسالة - دار عمار - ١٩٨٥ ئوردن - عەمان - چاپی یەكەم |
| نرخ: | (١٠) هەزار دینار |
| تیراژ: | ١٠٠٠ دانە |
| چاپخانە: | چاپخانەی شەهاب - هەولێر، شەقامی پەروەردەی گشتی<br>بەرامبەر وەزارەتی تەندروستی |

سەرچاوەی كتێب:
مجاهدالدين قايماز - نايب اربل و الموصل ٥٥٩-٥٩٥ الهجرية - ١١٦٤-١١٩٩ الميلادية
الدكتور صادق احمد داود جودة
استاذ مساعد بجامعة الامام محمد بن مسعود الاسلامية - الرياض
مؤسسة الرسالة - دار عمار
الطبعة الاولى ١٩٨٥
عمان - الاردن

ابو منصور قايماز { (مجاهد الدين بن عبد الله زيني) اربل صا-

حبي زين الدينك خادمی اولوب، بعده اعتاق واولا-

دينك اتابكلكنه تعيين اولنمشيدى . زين الدينك اوغلى مظفر الدينك زماننده اربلك مدبر امورى اولوب، اجراى عدل وداد، وشهر مذكورده برمدرسه ايله برخانقاه بنا، وبونلره بر چوق وقفلر تخصيص ايتمشيدى . بعده موصله انتقال ايله اتابك سيف الدين طرفندن موصل قلعەسنك ادارەسنه مأمور اولوب، اوراده دخى اجراى حقانيتله بر بيوك مدرسه، ايتامه مخصوص برمكتب، دجله اوزرنده برايكنجى كوپرى وسائر بويله خيراته موفق اولمش؛ و ٥٩٥ تاريخنده وفات ايتمشدر .

به ناوی خودای گەورە و دلوڤان

ئەم کتێبە پێشکەشە بە ڕووحی مێژوونووسی خوالیخۆشبوو (زوبیر بیلال اسماعیل) کە لە زەمانێکی زۆر خراپ و بە ئیمکانیاتێکی زۆر سادە، ئازایانە چەندین کتێبی دانیسقە و گرینگی نووسیوە و بڵاوکردۆنەوە .هەروەها پێشکەشە بە مامۆستا و مێژوونووسی هاوچەرخی گەورەی هەولێر و هەولێرییەکان (دکتور موحسین محمد حسین) ناسراو بە موحسین حەمڕا. کە خزمەتێکی زۆر گەورەی مێژوو و پرۆسەی نووسینەوەی مێژووی شاری هەولێری کردووە..

◄ تابلۆی هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر قەڵای ئەربل

◀ نەخشەیەکی کۆنی ئیمارەتی موسڵ ٥٩٩ کۆچی

# پێشەکی

## موجاهیدەدین قایماز
## والی ئەربل و موسڵ
## ٥٥٩/٥٩٥ کۆچی ١١٦٤/١١٩٩ زایینی

مێـژوو ئەوڕووداوانــە نیــن کــە ڕویانــداوە کاریگەرییــان بەســەر ســەردەمەکەی خۆیانــدا هەبــووە، بەڵکــو کاریگەریــان بەســەر ســەردەمی ئێســتاوەش هەســتی پــێ دەکرێــت و بەردەوامــە، بۆیــە خەڵکــی هەولێــری ســەدەی بیســت و یەکــەم، هەربەرهەمــی ژینکــە وبارودۆخــی ئابــووری و سیاســی و کۆمەڵایەتــی ئێســتای شــارەکەیان نیــن. بەڵکوسیاســەتمەدارو رۆشــنبیری هەولێــر کاریگــەری مێژووە دەوڵەمەنــدە ناسراو و نــاوداری شــارەکەی هەولێــر بەســەریەوە دیــارە . بۆیــە مێــژوو یەکێــک لــە پێکهێنــەرە ســەرەکیەکانی کەســایەتی سیاســەتمەدار و ڕۆشــنبیری هەولێــری هەمیشــە پایتەختــە!

شــاری قــەڵات و شــاری مێژوو شارســتانیەت وڕووحانیــەت وعەقلانییــەت، عەقلانیــەت بــە بەڵگــەی ئــەوەی کوردبەدرێژاییــی مێــژووی دووروو درێــژی ئەوەنــدە دەســکەوتەی لەنیــوەی دووەمــی ســەدەی بیستەمبەدەســت هێنــاوە لــە تێکــرای مێــژووی پێشــتری بەرچاوتــرە وە ئەمــەش کاتێکبــووە کەهەولێــر لــەو ماوەیــەدا بووەتــە

سەنتەری بزووتنەوەی ڕزگاری خواری کوردستان نەک هەر لەکوردستانی عێراق، بەڵکو لەهەرپێنج پارچەی کوردستان .
لەبارەی ڕۆشنبیریش کۆی مێژووی ڕۆشنبیری شاری هەولێر لەکۆی مێژووی ڕۆشنبیری هەر شارێکی کوردستان دەوڵەمەندترە هەرتوێژینەوەیەکی زانستی لەم ڕووەوەش بکرێت سەنتەربوونی هەولێر لەباری ڕۆشنبیری کوردی بەدرێژایی مێژوو بەدیار دەخات بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە بازیانەی پێچەوانەی ئەوە بلاودەکەنەوە وەکو هەڵەیەکی باوی ناوەندی ڕۆشنبیری کوردیش هەندێ کەس باوەڕیان پێکردووە.

دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە بۆمان دەردەکەوێت کەموسڵ لەسەدەکانی ناوەڕاست و بەشێکی سەدەی بیستەم کە لە سەرچاوەی تر دەردەکەوێت ، بەشێکی گرنگی خۆی لەدەست بەسەرداگرتنی هەولێر وەرگرتووە ، لەڕاستیدا هەولێر سەنتەری هێز و کانگای هێزی سیاسی و ڕۆشنبیری بووە نەک هەر بۆ خودی شارەکە بەڵکو بۆ زۆر شاری دەوررو بەر و هەندێک دوور لێشی تەنانەت لەکاتی نووسینی ئەم پێشەکییەش , بەغدای پایتەختی عێراق بەشێک لە هێزی خۆی لە هەولێر پایتەختی هەرێمی کوردستان وەردەگرێت ئەگەرچی ئەم ڕاستیە لە لای هەموو کەسێکیش ڕوون و ئاشکرا نەبێت.

بۆیە ئەم کارەی ( خەسرۆ پیربال) هەنگاویکە لەزنجیرە هەنگاوێک بۆ ڕوونکردنەوەی ڕۆڵی سەنتەری هەولێر لەمێژووی کورد و کوردستانو گرنگی لە ڕادەبەدەری ئەم شارە لە ڕووداوە مێژووییەکان لەسەر ئاستی ڕۆژهەڵاتی و ناوەڕاستی جیهان ، مێژووی هەولێریش مێژووی سەرجەم پێکهاتەکانیەتی و بەهەمووشیانەوە دەوڵەمەندترینە لەسەر ئاستی کوردستان بەڵام بە مۆرکە کوردیە زاڵەکەی ، لەم ڕووەوەش کاری زۆر ماوە بۆ هەڵدانەوەی لاپەڕە هەستپێنەکراوەکانی مێژووی هەولێر.

هیواداریـن نوسەری ئەم کتێبە بەردەوام بێ لەسەری و لەلایەنە پەیوەندیدارەکانی هەرێمی کوردستانیش لەگرنگی ئەم کارە بگەن و هاوکاری بن .

**د.محمد عبدالله کاکەسوور (مێژوونوس ، مامۆستا لە زانکۆی سەلاحەددین)**

**هەولێر لە ١٠-١١-٢٠٢١**

## کتێبی مجاهدالدین قایماز- والی اربل و موصل
## نائب اربل و الموصل ( ١١٦٤- ١١٩٩) میلادی

سالانێک بوو خەریکی نووسین و وەرگێران و پشکنینی ووردبووم دەربارەی مێژووی ئیمارەتی ئەربل و نووسینەوە و ئامادەکردنی مێژووی پڕ سەروەری مرۆڤایەتی سوڵتان موزەفەرەددینی گۆگبۆرو- سوڵتانی گەورەی هەولێر . لە دووتویێ چەند کتێبکدا بە هاوکاری خودای گەورە، کتێبی موزەفەرننامە و هێنانەوەی کتێبی( کتاب التنویر فی المولد السراج المنیر) لە مەغریبەوە بۆ هەرێمی کوردستان و ئامادەکردنیان و بڵاوکردنەوەیان، ئەزموون و سەرچاوە مێژوویەکانم ئاشنای چەند ناوێکی تریان کردم، یەکێک لەو ناو و کەسایەتیە نەناسراوانەی مێژوو و کتێبخانەی کوردستان بوو موجاهیدەددین قایماز بوو، ئەو پیاوە مەزنەی کە لە سەرەتادا، بەخێوکەر و مامۆستاو یاریدەدەرێکی زۆر تایبەتی میر سوڵتان موزەفەرەددین زەینەالدین عەلی کوچووک بووە، لەسەردەمی ئەتابەگییەکاندا، کاتێک موجاهیددەدین بەدیل دەگیرێت و دێتە ژێر فەرمانی باوکی سوڵتان موزەفەر گۆگبۆرو، بە فەرمانی باوکی و سەڵتەنەتی ئەتابەگیەکان، موجاهدالدین قایماز دەکرێتە هەڤاڵ و یاریدەرەر و فێرکەری تایبەتی سوڵتان موزەفەرەدین.

هەروەکوو دەردەکەوێت، مخابن، موجاهیدالدین قایماز، لە برادەر و یاریدەرو ڕاهێنەری( سیاسی- کۆمەڵایەتی- عەسکەری) سوڵتان موزەفەر، دەبێتە دووژمن و سەرچاوەی دڵتەنگی و زیندانی کردن و دوورخستنەوەی سوڵتان موزەفەرەدین لە هەولێر و پەیوەندییەکانیان تێک دەچێت .. ئیتر ئەو کتێبە نووسینەوەی مێژووی ئەو دوو کەسایەتیەیە.

حەزدەکەم بۆ مێژوو چەند هەقیقەتێکیش باس بکەم، ئەم هەوڵ وگەڕان و نووسین و لێکۆڵینەوە مێژوویانەی بەندە، لە چوارچێوەی خزمەتکردنی مێژووی دەوڵەمەندی ئیمارەتی هەولێر و هەولێرییەکانە، نووسینەوەی مێژووی زیاتر لە هەزار و دووسەد ساڵانی ڕابردووە، وە هیچ پەیوەندییەکی بە کارو باری سیاسی ئێستای هەرێمی کوردستاندا نیە . وە دەکەوێتە چوارچێوەی خزمەتکردن و ئاشکراکردنی مێژووی مەملەکەتە و هیچ پەیوەندیەکی نیە بە پرۆسەی سیاسی ئەم سەردەمە . ئەوەی من زانیومە و بۆم دەرکەوتووە، کە لێرە، لە گەڕەکی سەرای- قەڵای هەولێر، هەزار و سێ سەد ساڵ پێش ئێستا، ایمارەتێک هەبووە و شارستانیەکی ئاوەدان و پڕ نوورو بەرەکەت بوونی هەبووە . پێش درووستبوونی دەوڵەتی عوسمانیەکان، هاوتەریب لەگەڵ شەڕ و توندوتیژییەکانی سەردەمی سولەیمان پاشای

ئۆرتوغوڵ لە دۆڵی ئەنادۆڵ لە تورکیای ئیستادا، لەو کاتەدا، لەکوردستاندا، ئیمارەتێک بوونی هەبووە و پیاوێکی گەورە و خواناسێک حوکمی هەولێر و دەشتی شارەزووری کردوە ( کە لەو کاتەدا سنووری دەگەیشتە هەمەدان) ی ئێران.

لەبەرئەوەشە حەز دەکەم،نووسین و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەم لە چوارچێوەی ئەکادیمی و مێژووییەوە بخوێندرێتەوە و هیچ لێکدانەوەی سیاسی- تورکومانی بۆ نەکرێت و بەڵکوو ئاشکراکردن و نووسینەوەی لاپەڕە شاراوەو نەزانراوەکانی کتێبخانەی کوردستانی یە.

لەلایەکی تریشەوە، مەبەستم لە خستنەروو و نووسینی ئەو مێژووە دەوڵەمەندەی ئیمارەتی ئەربل و حوکمی سوڵتان موزەفەرەدین و سەردەمە زێڕینەکەی لەوەدایە، دەمەوێت، گەنجان و خەڵکی هەولێر و کوردستان، ئاشنابن بەو مێژووە شارستانیە کۆنەی خۆیان و هەست بە کەسایەتی و بوونی خۆیان بکەن . بزانن کە ئێمە خاوەن شارستانیەکی کۆنیین،شارستانی و دەوڵەتداری و مەملەکەتی ئێمە، زۆر لە فارس و عەجەم و تورک و عەرەبەکان کۆنتر و ڕەسەنترە....

ناوی موجاهیدالدین قایماز، لەچەند سەرچاوەیەکی مێژوویی دا هاتووە، بەڵام لەو کتێبەدا بە شێوەیەکی تایبەت باس لە ژیان و حوکمی کراوە، من بە ئەمانەتەوە، وەکوو خۆی دەیخەمە بەرچاوانتان

..دیــاره لــه کتێبەکــەدا هیــچ نەخشــه و وێنــه یــەک نیــه، بــەڵام بەنــده ویســتوومه کتیبەکــه زیاتــر دەوڵەمەنــد بێــت بــه نەخشــه و وێنــه و زانیارییەکانــی ئــەو ســەردەمەدا، لەبەرئــەوه بــه پێویســتم زانــی وەکــوو بەڵگەنامــه و هاوپێچــی کتێبەکــه بڵاوبکرێتــەوه .

لــه کۆتاییــدا هیــوادارم توانیبیتــم خزمەتێــک بــه مێــژووی دەوڵەمەنــدی شارســتانی ئیمارەتــی ئەربــل و لاپــەڕه بزربووەکانــی مێــژووی هەولێــرم کردبێــت ..کەلێنێکــی کتێبخانــەی کوردیــم پڕکردبێتــەوه.

والله من وراء القصد....

خەسرەو پیرباڵ القصاب

هەولێر له ١٤–١٠–٢٠٢١

ڕێکەوتی ٨–٣–١٤٤٣ ربیع الاول

# موجاهیدەدین قایماز.. والی اربل و موسڵ لاپەڕەیەکی مێژوویی بزربووی مەملەکەت...

دکتور فەیسەڵ عارب

دەڵێن «ئەوەی مێژوو نەخوێنێتەوە، ناچار دەبێ دووبارەی بکاتەوە». مێژوو دەبێ بۆ ئەوە بخوێنرێتەوە هەتا وانەی لێ فێربین. شاری هەولێری دێرین، مێژوویکی یەکجار کۆن و چڕوپڕی هەیە. بەدەیان سەرکردە و سەتان زانا و دانا و هەزاران شەڕکەر و جەنگاوەر رووداویان تێدا دروست کردووەو بەسەرهاتیان بۆ خۆیان و دانیشتووانەکەی تۆمارکردووە. ئێمە لەوانەیە لەمێژووی کۆنی هەولێر هەر ناو و ناوبانگی موزەفەرەددینمان بیستبێ، بەلاّم زۆری دیکە لەقۆناغە جیاوازەکانی ژیان، لەو شارەدا، جێ دەستی خۆیان لەسەر خاکەکەی بەجێهێشتووە.

موجاهیدەددین قایماز یەکێک بووە لەو سەرکردانەی کە لەسەردەمێکی پڕ لەڕووداوی جۆراوجۆر و هەبوونی سەرکردەی ناوداری وەکو سەلاحەددینی ئەیووبی، توانیوویەتی ناوبانگێک بۆ خۆی، لەسەر لاپەڕە زەردهەڵگەڕاوەکانی مێژووی ئەو شارە و دەوروپشتی و ناوچەکە پەیدا بکا، نەک هەر لە بواری شەڕ و سەربازیدا، بەڵکو لەبوارەکانی دیکەی ئاوەدانی و رۆشنبیری.

ژیانی ئەو سەرکردەیە زۆر لەوە پتر هەڵدەگرێ تەنیا بەنامیلکەیەکی بچووکی چەند لاپەڕەیی وردبکرێتەوە، بەلاّم

لەگـەڵ ئەوەشـدا، دەسـتبردنی بـرای بەڕێـزم کاک خەسـرۆ پیربـاڵ بـۆ ناسـاندن و وەبیرهێنانـەوەی ئـەو کەسـایەتیە، جێـی سـوپاس و دەستخۆشـیە و هیـوادارم لـەو بـوارەی زیندووکردنـەوەی مێژووی هەولێر و ئەو کەسایەتیانەی رۆڵیان گێڕاوە، لەسـەردەمە جیاوازەکانـی مێـژووی ئـەو شـارە، سـارد نەبێتـەوەو بـەردەوام و نـاوە نـاوە کەسـایەتیەکی ئەوتۆمـان پـێ بناسێنێ کـە دەستی لەبنیاتنـان و ئاوەدانکردنـەوەو پێشخستن و پاراسـتنی شـارەکەماندا هەبـووە.

بەخوێندنـەوەی نامیلکـەی (موجاهیدەددیـن قایمـاز) چوومـە نـاو مێژوویەکـی دووررودێـژی پـڕ سـەروەریی شـارەکەم و چێژێکـی ئەتـۆی پـێ بەخشـیم کـە وای لێکـردم بـەدوای هەمـوو ئـەو سـەرچاوانەدا بگەڕێـم کـە بـۆ نووسـینی ئـەو کتێبـە پشـتیان پـێ بەستراوەو تامـەزرۆی زانیاریـی زۆرتـری کـردم لـەو بـوارە گرنگـەدا.

جێگـەی داخـە کـە هێشـتا نەگەیشـتووینەتە ئـەو ئاسـتەی مێژووەکەمـان بکەینـە بناغەیـەک بـۆ دووبـارە داڕشـتنەوەی نیشـتمانەکەمان، لـەڕووی بنیاتنـان و رۆشـنبیری و زانسـت و خزمەتگوزاریـی هەمەجـۆر و لێبووردەیـی و خاکیبوونـی سـەرکردە و پێشـەواکانمان.

بەدەیان شـاعیر و نووسـەر و سۆفی و مێژوونووس لەبن دەست و لەژێـر سـایەی ئـەو سـەرکردە سـەربازیە، لـەو شـارەدا، لە کەشـوهەوایەکی گونجـاودا ژیـاون و کار و ئەرکەکانـی خۆیـان بەجـێ گەیانـدووە و بـۆ سوارچاکی و ئازایەتـی و بەخشـندەیی و لێبووردەییەکەی، ستایشـیان کـردووە و پێیانـدا هەڵگوتـووە

و ئازایەتـی و جەربەزییەكانـی ئـەو زاتەیـان بـۆ ئێمـە تۆمـار كـردووە كـە، بەداخـەوە دەڵێـم، بێگانـان پتـر لەخەمـی زیندووكردنـەوەی ئـەو كەسـایەتی و ئـەو مێـژووە دێرینـەی ئێمـە بـوون، پێـش ئـەوەی خۆمـان دەستی بـۆ ببەیـن.

لـەو بـاوەڕەدام، لەژێـر هـەر بستێكی خاكـی قەڵاتـی سەركەشـی هەولێر و خاكە پان و بەرینەكەی دا، دەیان و سەتان شوێنەوار و جێ پەنجـەی رەنگیـن هـەن كە گەواهـی بـۆ زیندوویێتـی ئـەو شـارە دەدەن و پەردە لەسـەر زۆر لەو كەسایەتیانە هەڵدەدەنەوە كـە، رۆژێـك لـەڕۆژان، خەریكـی ئاوەدانكردنـەوەی بـوون. مخابـن هێشـتا سـەنتەرێك، رێكخراوێـك، دەزگایەكـی تایبـەت بەزیندووكردنـەوەی مێـژوو و شـوێنەواری هەولێرمـان نیـە.

ئـەوە دەبـوو ئەركـی وەزارەت و حكوومـەت بووایـە و بودجـەی تایبەتیـی بـۆ تەرخـان كرابایـە و مامۆسـتا و خوێنـدكار و قوتابیـی بـۆ ئامـادە كرابایـە، بـۆ ئـەوەی زانستیانە دەست بـۆ ئـەو ئەركـە پیـرۆزە ببـەن و سـەردەمیانە لەشـوێنەوار و مێژووەكـەی بكۆڵنـەوە و لایەنـە شـاراوەو سـوڕگومكراوەكانی بێننـەوە گـۆڕێ، كـە سـەردەمێك دوژمنـان هەوڵـی شـاردنەوە و لەناوبردنـی دابـوون، چونكـە دەیانزانـی ئەگـەر لێگەڕێـن بدۆزرێنـەوەو تـۆز و خۆڵـی زەمانەیـان لـێ بتەكێنـرێ و لێیـان بكۆڵرێتـەوە، چ سـەروەری و شـانازیەك بـۆ ئـەم شـارە و دانیشـتووانەكەی وەبیـر دێننـەوە.

لەسـەردەمە كۆنـەكان، هەولێـر بەشـار و ناوچەیەكـی پـڕ لـە خێـر و خۆشـی و بەپیتیـی خاكەكـەی ناسرا بوو، بۆیە هەمیشـە دەسـەڵاتداران چاویـان بڕیبـووە داهـات و شـوێنە قایمەكـەی،

بەلام قەلات و دانیشتووانەكەی هەرگیز ملیان نەداوە بۆ داگیركەرێك كە سەرشۆڕ و ملكەچیان بكا. تەنیا ئەوانە دڵی خەڵكی ئەو شارەیان بۆ خۆیان راكێشاوە كە ژیان و دەسەلاتیان لەپێناو پێشخستن و خۆشگوزەرانی تەرخان كردووە.

قایماز یەكێك بووە لەوانەی خەڵكی هەولێر خۆشیان ویستووە و داوایان لێكردووە فەرمانڕەوایەتیان بكا، چونكە ئەو كەسایەتیە بەوە بەناوبانگ بووە كە هەمیشە بەدوای ئاوەدانكردنەوەو بنیاتنانی مزگەوت و خانەقا و شوێنی خوێندن و داڵدەدانی بێ سەرپەرشتان و زانا و شاعیر و فەقێیان بووەو لەسەر دەستی ئەو، لەم شارەدا، چەندان سەنتەری خوێندن و سۆفیگەری و خانەقا و مزگەفت دروستكراون و ناو و ناوبانگی ئەویان هەڵگرتووە.

چەندی لەسەر بایەخی مێژووی ئەو شارە و رۆڵی گرنگی لەمێژوودا بڵێین و بنووسین، هەر مافی خۆی نادەینێ، دەستخۆشی لەبرای بەڕێزم كاك خەسرۆ پیربال هەولێری دەكەم كە ماوەیەكە شانی داوەتە بەر ئەو ئەركە قورسە، لەخودای مەزن دەپاڕێمەوە دەست بەتەمەنی بگرێ و بەرهەمی تازە و نایابترمان پێشكەش بكا..

# دكتور فیصل عارە ب بڵباس، نووسەر و ڕوشنبیرێكی هەولێری و دڵبڵندە سالانێكە پێكەوە لەسەر مێژووی هەولێر كاردەكەین .
لێرەدا بەشانازییەوە، سوپاسی گەرمی دەكەم و خوم ئەو كتێبەم منەتبار و قەرزارینە....

# بەناوی خودای بەخشندەی دلۆڤان

**تێبینیەک:خوێنەری بەڕێز..**

پێش دەستکردن بەخوێندنەوەی ئەم کتێبە، تکایە ئاگاداری ئەمانە بە:

لەبەر ئەوەی کتێبەکە لەسەر مێژووی هەزار ساڵێک لەمەوبەرە، بۆیە هەندێک ناسناو و دەستەواژەی تێدایە کە هی ئەو کاتن و ئێستا بەکار نایێن. ئەگەر ئەوانە بکەینە کوردی، رەنگە بەرامبەریان نەبێ، یان واتاکانیان بگۆڕێ، بۆیە بەم شێوەیەی خوارەوە کردوومانن بەکوردی، بۆ زانین:

١- ناوی سوڵتان وەکو خۆی دانراوەتەوە بەبێ گۆڕین.
٢- أمیر کراوە بە میر.
٣- ئیمارەت هەر وەکو خۆی بەکار هاتووە.
٤- (اقطاع) کراوە بە دابڕاو یان دابڕێنراو،(اقتگعە) بەسەریدابڕی.
٥- (غلمان) یان وەکو خۆی یان کراوە بە(کۆیلە).
٦- (اعمال) بەواتای ئەو ناوچانەی کە سەر بەشارێکن.
٧- (الملک العادل) کراوە بەپاشای دادپەروەر.
٨- ناوی(ئەربل) کە مەبەست لەشاری هەولێرە وەکو خۆی بەکارهاتووە و نەکراوە بە ئەربیل یان هەولێر.
٩- (پ) و (چ) و (ڤ)ی عەرەبی کراوەتە(س یان ز).
١٠- شیعرەکان نەکراونە کوردی و وەکو خۆیان دانراونەتەوە.
١١- (سنجار) کراوە بە شەنگال.

١٢– (النائب) ئەوکەسەی کە دەسەلاتی شارێکی لەدەست بووەو لەمیر نزمتر بووە. لەکوردیەکە کراوە بە(جێگر) بۆ نموونە: جێگری موسڵ یان ئەربل واتە(نائب اربل).– والی مەملەکەت (محافظ)

١٣– (الملک المصلح) کراوە بە پاشای چاکەکار.

یان الملک الصالح – الصالح–

ئەم کتێبە مێژوویی یە دەربارەی امارەتی اربل و مێژووی ئەتابەگیەکانە کە باس لە حوکمی موجاهیدەدین قایماز دەکات، کاتێک وەکوو والی قەلای هەولێر دەستنیشانکراوە. لەبەر ئەوە ناوەکان، ناو و سیفە تە میرییەکانی هەزار ساڵ پێش ئیستامانە، لەبەر ئەوە هەولم داوە وەکوو خۆی بەکاری بهێنم و بیانووسمەوە .

خەسرەو پیرباڵ القصاب

# پێشەکی

(١)

لەکۆتاییەکانی سەتەی پێنجەمی کۆچی/یازدەی زایینی، بارودۆخی لەناکاوی سەر گۆڕەپانی ئیسلامی وای دەخواست کە شاری موسڵ، کە ئەوکات بنکەیەکی هەرێمیی جەزیرەی فورات بوو لەباکووری عێراق و شام، بەرەوڕووی دوژمنکارییەک بێتەوە، چونکە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی کەوتە بەر هێرشێکی خاچپەرستانەی زۆر دڕ کە مەبەستی لەناوبردنی قەوارەی ئیسلامی بوو لەشام و دامەزراندنی چەند قەوارەیەکی خاچپەرستانە لەسەر کەلاوەکانی.

خاچپەرستەکان هەلی لاوازبوونی جیهانی ئیسلامیان قۆزتەوە کە لەئەنجامی پەرتبوونی ئەوکات هاتبووە کایەوەو توانیان بگەنە ئامانجەکەیان بەوەی کە چەند میرنشینەکیان لە ڕەها و ئەنتاکیا و تەڕابوڵس و قودس دامەزراند.

ئەو هێزە ئیسلامیانەی کە دەبوو ڕێ لەو دوژمنکاریانە بگرن، لەڕەوشێکی لاواز و پەرتەوازەیی دا بوون، ئەوەش ئەرکی خاچپەرستەکانی ئاسانترکردبوو. ئەوەتە خەلیفە لەبەغداد هیچ هێز و توانایەک لەدەست نەمابوو بەرامبەر ئەو سەلجووقیانەی کە ئەوانیش لەناو خۆیاندا لەدوادواییەکانی سەتەی پێنجەمی کۆچیدا کەوتبوونە ناو ناکۆکیەکی زۆر توند لەسەر سەرۆکایەتیکردنی تەختی

سەلجووقی. لەکاتێکدا خەلافەتی فاتمیەکان ئەویش لەباروودۆخێکی ئەوەندە لاواز و پەرتەوازەییدا بوو کە کەس ئێرەیی پێ نەدەبردن.

لێرەدا خۆبەختکردنەکانی (موسڵ)مان بۆ دەردەکەوێ. ئەو شارەی کە پیاوەکانی ئەرکی رووبەڕووبوونەوەی ئەو دوژمنکاریانەیان گرتە ئەستۆی خۆیان و دروشمی «یەکێتیی ئیسلامی تاکە ڕێگەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی دوژمن»یان بەرزکردەوەو بەکردەوەو گوفتاریش ئەوەندەی توانیان بەجێیان گەیاند.

ئەوەی کە لەگەڵ لۆجیکی واقیعیدا ڕێکدەکەوێ ئەوەیە کە شاری موسڵ هەوڵی یەکگرتنی هەوڵەکان بدا و دەسەڵاتی خۆی، ئەگەر بەبەکارهێنانی هێزیش بێ، بەسەر ئەو شار و ناوچانەدا بسەپێنێ کە لێی نزیکن، بۆ ئەوەی سەرچاوەیەکی مرۆیی و دارایی نەپساوە بۆ بەرەکانی شەڕ دابین بکا و ڕەوانەیان بکا.

لەو شارانەی کە موسڵ هەوڵی کۆنترۆڵکردنی دان شاری (ئەربل) بوو. ئەو شارەی کە هەر لەسەردەمی ئاشووریەکانەوە، لەڕۆژانی پێش زایین، ناوبانگێکی جوگرافی و بازرگانیی نایابی هەبووە(١). ئەو ناوبانگەشی بەدرێژایی رۆژانی مێژوو هەر مابۆوە. هەروەها ئەربل بەناوەندێکی ستراتیجی دادەنرا بۆ موسڵ چونکە کلیلی ئەو بەرە درێژەی باشووری رۆژاوای بوو، بەجۆرێک کە نزیکەی ٨٠ کیلۆمەتر(٢) لێی دوورەو دەست بەسەرداگرتنی

بـۆ موسـڵ زۆر دەسـتکەوتی دەبـێ. ئەمـەش کـە ئەتابەگـی موسـڵ، عیمادەددیـن زەنگـی، هـەر لـەڕۆژە یەکەمەکانـی دەسـەڵاتی لەسـاڵی ٥٢٢ک/١١٢٨ز پێـی زانیبـوو، ئەوکاتـەی کـە دەسـتی بەسـەرداگرت(٣).

بەپێـی سیسـتەمی ئەتابەگـی لەموسـڵ، هـەر لەسـاڵی ٥٣٩ کۆچیـەوە، ئەربـل بـووە ناوچەیـەک بـۆ جێگرەکـەی زەینەددیـن عەلـی کوچـک. بەپێـی نەریتـی خـاوەن ناوچـەکان زەینەددیـن لەجیاتیـی خـۆی، موجاهیدەددیـن قەیمـازی لەسـاڵی ٥٥٩ک/١١٦٤زلەسـەر دانـاو منداڵەکانـی خـۆی پـێ سـپاردبۆ ئـەوەی لەئەربـل چـاوی لێیـان بێـو متمانـەی تـەوای خـۆی پـێ بەخشـی چونکـە هـەر لەمنداڵیـەوە چاکـە و خێـری تێڕادەبینـی.

## بەڵام قایماز کێیە؟

ئـەو سـەرچاوانەی کـە لەبـەر دەسـتدان جەخـت لـەوە دەکەنـەوە کـە ئـەو: ئەبـو مەنسوور قایمـاز کـوڕی عەبـدوڵای ئەلزەینیـی ناسـراو بـە موجاهیدەددیـن خادیمـی رۆمیـە(٤) و بەڕەچەڵـەک دەگەڕێتـەوە بـۆ سەجسـتان(٥).

هـەر لەمنداڵیـەوە نیشـانەکانی خانەدانیـی لـێ دەرکەوتـووەو زەینەددیـن کـوڕی عەلـی کـوڕی بەکتەکیـن لەشـارەکەی بەگچکەیـی هێناویـە(٦). زینەددیـن خـۆی یەکێـک بـووە لەمەمالیکەکانـی قەسـیم ئەلدەولـەی باوکـی عیمادەددیـن زەنگیـی دامەزرێنـی ئەتابەگیـی موسـڵ، کـە

تێیــدا بــووە جێگــری ئەتابەگــی لەموســڵ. کــە قایمــاز گەورەبــوو، زەینەددیــن عەلــی پێشــی ئاوکووفەکانــی خســت و کردیــە ئەتابەگــی منداڵەکانــی لەئەربــل و هــەر لەســاڵی ٥٥٩ک/١١٦٤ز متمانــەی تــەواوی پــێ بەخشــی(٧).

قایمــاز بەباشــترین شــێوە بــەردەوام بــوو لەســەر ئــەو ئەرکــەی پێــی ســپێردرابوو و لەڕێــی بەڕێوەبردنــە باشــەکەی توانــی خۆشەویســتیی جەمــاوەری ئەربــل، وەکــو جێگــری زەینەددیــن، کــە جێگریــی لەموسڵی زەنگیــدا بەڕێوەدەبــرد، بەدەســت بێنــێ. کــە زەینەدیــن عەلــی کوچکیــش لەســاڵی ٥٦٣ک/١١٦٨ز مــرد(٨)، ئەربــل و دەوروپشــتەکانی بوونــە ئەمانەتێــک لەئەســتۆی موجاهیدەددیــن.

هەرچەنــدە موزەفەرەددیــن گۆکبــوروی کــوڕە گــەورەی زەینەدیــن، دوای مردنــی باوکــی فەرمانڕەواییــی وەرگــرت، بــەڵام موجاهیدەددیــن کۆنترۆڵــی حوکمەکــەی دەکــرد. ئیبــن ئەلئەسیر(٩) دەڵــێ فەرمانڕەوایــی ئەربل لەڕاستیدا لەدەستی موجاهیدەددیــن قایمازبــوو بەهەمــوو مانــا و راستیەکیەوە. ئــەوەش لەگــەڵ واقیعەکــەدا دەگونجــێ، چونکــە رێــی تێناچــێ ئــەو قایمــازەی کــە جێگریــی ئەربلــی ماوەیەکــە وەرگرتــووە، قوربانــی بەئاینــدە سیاســیەکەی خــۆی لــەو ناوچەیــەدا بدا، تەنیــا بــۆ قایلکردنــی گۆکبــورو یــان یەکێکــی دیکــە، بەتایبەتیــش کــە گۆکبــورو خــاوەن زانایــی و شــارەزاییەکی سیاســی و ئیــداری ئەوتــۆ نەبــوو وای لێبــکا کارەکانــی فەرمانڕەوایــی لەدەســتی خۆیــدا بگــرێ(١٠). یــان ئەوەتــا

گۆکبورو لەخۆیەوە بەبیری داهاتووە کە دەست لەقایماز هەڵگرێ، ئەوەش قایماز خودی خۆی پێی قایل نابێ، بۆیە دەستی بەسەر فەرمانڕەوایەتیەکەدا توند کردووە.

هەرچیەک بێ، ئەوا ئەم دوو پیاوە، موزەفەرەددین گۆکبورو و موجاهیدەددین قایماز، هەریەکە هەوڵی ئەوەی دەدا لە هاوڕێیەکەی رزگاری بێ، ئەوەش بەپێی ئەو هۆکارانەی کە پێی وابوو لەبەرژەوەندیی ئەوە. ئەوەتا موزەفەرەددین گۆکبورو دەیەوێ فەرمانڕەوایی بەتەواوی بۆ خۆی بێ، بەبێ چاودێری و رێنمایی موجاهیدەددین. موجاهیدەددینیش لەهەمان کاتدا دەیەوێ فەرمانڕەواییەکە بەپێی بۆچوونی ئەو و لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا بێ، چونکە خۆی بەوە دادەنا کە چاکەی بەسەر گۆکبورو و خانەوادەکەیەوە هەیە، لەکاتێکدا موزەفەرەددین خۆی بەخاوەنی شەرعیی فەرمانڕەواییەکە دەزانی و لەسەر هەمووانە کە دەبێ فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن، بەو پێیەی بەتەمەن گەورەترین کەسی ناو خانەوادەی گۆکبوروە. موجاهیدەددین لەوەی کە بۆی دەچوو پشتی بە دوو شت دەبەستا:

یەکەم: ئەو متمانەیەی کە دامەزرێنی ئەتابەکی زەینەددین عەلی کوچوک باوکی موزەفرەددین پێیدابوو لەبەر ئەوەی ئەو لەموزەفەرەددین بەتواناترە لەبەڕێوەبردنی حوکمڕانیدا، بۆیە مافی ئەوەی هەیە سەرپەرشتی بکا و رێنمایی بدا.

دووەم: ئەو متمانەیەی کە موجاهیدەددین لەدانیشتووانەکانەوە بەدەستی هێنا لەماوەی سالانی فەرمانڕەوایی هەر لەسالی ٥٥٩ک/١١٦٤ز کە ئەو هێزەی لەبەرامبەر گۆکبوورو دایێ و وای لەبڕیارەکانی کرد توانای بەردەوامبوونیان هەبێ(١١).

ئەوەی لەکاروباران بکۆڵیتەوە تێبینی ئەوە دەکا کە هەر دەبێ کێشەکەی نێوان دوو لای دژ بەیەک بەلای یەکێکیاندا یەلایی ببێتەوەو ئەوەی پتریش لێی وردبێتەوە دەتوانێ بلێ کە کاروبارەکە لەبەرژەوەندیی موجاهیدەددین قایماز بەڕێوە دەچێ، لەبەر ئەوەی هێزی گەلی لەپشتە لەبەرامبەر هێزی مافی شەرعیی موزەفەرەددین، لەسەر بناغەی ئەوەی کە گەورەترین منداڵی زەینەدددین عەلی کوچوکی دامەزرێنەری ئەتابەگیی(ئیمارەتی) ئەربلە.

پشت بەستنی موجاهیدەددین قایماز بەهێزی گەل و پشتیووانیکردنی وای لێکرد کە کۆنووسێک بنووسێ کە تێیدا هاتبوو موزەفەرەددین گۆکبورو بەکەڵکی ئەوە نایێبێتەفەرمانڕەوا. پاشان کە راوێژ بەخەلیفەی عەباسی دەکا لەبەغدا، دەست بەسەری دەکا و لەشوێنەکەی دا برا گچکەکەی زەینەددین یوسف دادەنێ(١٢). ئەوە بۆمان دەسەلمێنێ کە زۆر پێویست بوو راوێژ بەخەلیفەی عەباسی بکا لەو کاتەی کە کاروبارێک بەسەر دەوڵەتۆچکەکانی ئیسلام دادێ.

ئەوەی لێی وردبێتەوە تێبینی دەکا کە کارەکەی موجاهیدەددین قایماز و نووسی کۆنووسێک تێیدا داوای

لابردنی موزەفەرەددینی کردووە زۆر بەوە دەچێ کە هەندێک لەفەرمانڕەوایانی ئەمڕۆ پەنای بۆ دەبەن، لەوانە ئەنجامدانی راپرسی بۆ تێپەڕاندنی ئەوەی کە دەیانەوێ بەپشت بەستن بە پێویستیی راپرسی گەل.

سەیرە کە سەرچاوەکانی بەردەستن بەدرێژی باسی ناکۆکیەکانی نێوان موجاهیدەددین قایماز و موزەفەرەددین گۆگبورو ناکەن، بەڵکو تەنیا هەندێک ئاماژەی کورت دێننەوە کە پەردە لەسەر ئەو کێشانە لانادا، لەوانەش وەکو (تووڕەبوونی قایماز لەموزەفەرەددین گۆگبورو) بێ ئەوەی هۆکارەکانی ئەو تووڕەبوونە ناو بنێن(١٣). ساڵی ٥٦٩ک ١١٧٤ز(١٤).

بەڵام ئەو سەرچاوانە هەموویان لەیەک کاتدا کۆکن لەسەر ئەوەی کە موجاهیدەددین قایماز پیاوێک بووە کە خۆشەویستیی بۆ گەورەکانی سەر بەبنەماڵەی بەکتەکین هەبووە و لەخزمەتیاندا خۆی بەخت کردووە. هەروەها ئاماژەش بۆ ئەوە دەکەن کە هەمان هەستی بەرامبەر گەورەکانی تازەی فەرمانڕەوایانی موسڵ هەبووە، ئەمەش وای لێردووە کە بەوەفاداری و دڵسۆزی ناوبانگ دەربکا(١٥).

لەپێی ئەوانەی کە لەسەر ئەو خاڵە گوتران، دەتوانین بڵێین کە کێشەکە لەبنەڕەتدا لەنێوان موزەفەرەددین گۆگبورو و موجاهیدەددین قایماز، دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی تێڕوانینیان بۆ فەرمانڕەوایەتی. ئەوەتە

موزەفەرەددینی گەنجی بەپەرۆشی پڕ لەچوستی و چەکدار بەحەزوئارەزووەکانی گەنجی، دەیەوێ سەربەخۆ فەرمانڕەوایەتی بکا بەبێ ئەوەی کەسێک ئاڕاستەی بکا یان یەکێک پێی رابگەیەنێ و دەیەوێ پاشکۆبوونی خۆی بۆ موسڵ نەیەڵێ. لەکاتێکدا کە قایماز دەیویست خۆی فەرمانڕەوا بێ، چونکە بەشارەزایی پیرەمێردان چەکدارە و پێی وایە باشترە بۆ ئەربل لەژێر کۆنترۆڵی موسڵ بمێنێتەوە، چونکە ئەوە گارەنتیی سەقامگیریی دەکا و سەربەرزیی بۆ دەستەبەر دەکا و فەرمانڕەوایانی موسڵیش لەخۆی رازی دەکا(١٦).

گرنگ ئەوە بوو کە موزەفەرەددین گۆکبورو لەفەرمانڕەوایەتی لادرا و خرایە بەندیخانەوە. پاشان لەبەندیخانە دەرهێنرا و ئەویش لە ئەربل چووە دەرێ بەو هیوایەی یەکێک بدۆزێتەوە کە یارمەتیی بدا بۆ گەڕانەوەی بۆ سەر فەرمانڕەوایەتی. رووی لەبەغداد کرد کە پێی وابوو خەلیفەی عەباسی پشتگیریی دەکا و ئەو یارمەتیەی دەدا کە لەململانێی لەگەڵ قایماز پێویستی پێی دەبێ. بەڵام لەبیری چووبوو کە قایماز ئەگەر بەراوێژکردنی بەخەلافەتی عەباسی نەبوایە ئەو کارەی نەدەکرد. هەر ئەوەشە کە ئاشکرای دەکا بۆچی خەلیفەی عەباسی ئاوڕی لە داواکاریەکانی نەدایەوە(١٧).

لەوانەیە لەگرنگترین هۆکارێکی کە وای لەخەلیفە کردبێ کە داواکاریەکەی موزەفەرەددین پشتگوێ بخا، گچکەیی

تەمەنی و تازەیی بێ لەسەر فەرمانڕەوایی وە نەبوونی شارەزاییش، ئەگەر بەراوردی بکەین بەموجاهیدەددین قایماز. بگرە زێدەڕۆیی ناکەین ئەگەر گوتمان لاوازیی ئەوکاتی خەلافەتی عەباسی و نەتوانینی لەپێشکەشکردنی یارمەتیەکی راستەقینە بۆ موزەفەرەددین لەململانێی لەگەڵ موجاهیدەددین قایمازدالەگرنگترین ئەو هۆکارانە بوون کە نەیانهێشت دەست لەناو ئەو ململانێیە وەربدا(١٨). یان خەلافەت وای بینیووە کە پێویست ناکا خۆی بەکارێکەوە خەریک بکا کە بەشێوەیەکی باشتر کۆتایی هاتووە.

لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە موزەفەرەددین لەبەغداد ئاواتەکەی نەهاتە جێ، بۆیە ئەملا و ئەولای دەکرد و بیری دەکردەوە کە چی لەدەست دێ بیکا، ئایا خۆی رادەستی ئەوە بکا کە لەئەربل بەسەری هات یان هەوڵی دۆزینەوەی هاوپەیمانیەک بدا کە پشتیوانیی بکا بۆ لادانی قایماز؟ پاشان دەبێ ئەو هاوپەیمانە کێ بێ؟ دوای بیرکردنەوەو لێ وردبوونەوە، بڕیاری دا پەنا بباتە بەر موسڵ بەو ئامانجەی چارەیەکی گونجاوی لێوە دەستکەوێ. دوای ئەوەی هیچ چارەیەکی لەبەغداد دەست نەکەوت و فەرمانڕەوای ئەوکاتی موسڵیش سەیفەددین غازیی دووەم بوو(٥٦٥-٥٧٦ک/١١٧٠،١١٦٩-١١٨٠ز) کە بەگەرمی پێشوازیی لەموزەفەرەددین کرد و ناوچەی حەڕرانی دایێ و خستیە خزمەتی. لەوانەیە سەیفەددین ئەو چارەسەریەی وا بینیبێ کە لەشەڕی موزەفەرەددین

دوور دەبێ و قایمازیش بەپاشکۆیەتی بۆ موسڵ لەئەربل دەمێنێتەوە(١٩).

**موجاهیدەددین قایماز لەموسڵ:**

دوای دەرچوونی موزەفەرەددین گۆکبورو و وەرگرتنی زەینەددین یوسفی برای فەرمانڕەوایی ئەربل، بەڕێنمایی قایماز پەیوەندیەکانی ئەربل بەموسڵەوە بەباشی مانەوە. ئەوەش واتە بەردەوامیی پاشکۆبوونی ئەربل بۆ موسڵ لەو ماوە مێژووییەدا. هەر ئەوەش بوو کە موجاهیدەددین قایماز پێی باش بوو.

دوای شکانی سوپایەکەی لەبەرامبەر سوپایەکانی سەلاحەددینی ئەیووبی لەنزیک شاری حەلەب لەناوچەی گردی سوڵتان(تل السلطان) لە ١٠ی مانگی شەووالی ساڵی ٥٧١ک/٢٣ی نیسانی ساڵی ١١٧٦ک(٢٠) بارودۆخی موسڵ پەرەی سەند و دۆخەکە لەموسڵوای دەخواست کەسایەتیەکی بەتوانا هەبێ کاروبارەکان بگەڕێنێتەوە دۆخی جارانی، بەتایبەتیشکەباری سەیفەددینغازیی دووەمی فەرمانڕەوایەکەی بەجۆرێک خراپ ببوو کە لەهێرشی سەلاحەددینی ئەیووبی بۆ سەر موسڵ دەترسا(٢١). ئەگەر بانگهێشتکردنی سەیفەددین غازیی دووەم بۆ موجاهیدەددین قایماز لەزیلحیججەی ساڵی ٥٧١ک/حوزەیرانی ساڵی ١١٧٦ز نەبوایە، بۆ ئەوەی سەرپەرشتیی هێورکردنەوەی بارودۆخەکە بکا، چونکە بەئازایەتی و خۆڕاگری و کارزانی ناسرابوو، ئەوا شتێکی دیکە رووی دەدا، بگرە

دەبـووە هـۆی ئـەوەی سـەیفەددین شـارەکە بەجـێ بێڵـێ.

ئـەوەی گرنگـە موجاهیدەددیـن متمانـەی سـەیفەددین غازیـی خاوەنـی موسـڵی بەجۆرێـک بەدەسـت هێنـا کـە هەمـوو کاروبارەکانـی رادەسـت کـرد، تـا ئـەو رادەیـەی کـە ئیبـن ئەسـیر دەڵـێ(٢٢): (هەمـوو کاروبارەکانـی دایـە دەسـتی، هـەر لەچارەسـەرکردن و کردنـەوەی گرێکوێـرەو بـەرز و نزمکردنـەوەش).

لەدیاردەکانـی ئـەو متمانـە زۆرەی کـە سـەیفەددین غازیـی دووەم بەموجاهیدەددیـن قایمـازی بەخشـی، رادەسـتکردنی فەرماندەییـی گشـتیی سـوپا و پێـی وابـوو شکسـتی سـوپایەکانی موسـڵ لەشـەڕکردنیان لەگـەڵ سـەلاحەددین بەپلـەی یەکـەم دەگەڕێتـەوە بـۆ شکسـتی ئـەو پلانـە سـەربازیانەی کـە فەرماندەکـەی پێشـوو مەحمـوود زولفنـدار دایناپـوون، بۆیـە فەرمانـی دا بەنـد بکرێ و فەرماندەییەکـەی رادەسـتی موجاهیدەددیـن قایمـاز کـرد(٢٣).

سـەرباری ئـەو پۆسـتە باڵایـەی کـە وەکـو ئەندامـی قەڵاتـی موسـڵ کاری دەکـرد هـەر لـەو رۆژەی هاتنـی لەمانگـی زیلحیججـەی سـاڵی ٥٧١ک/١١٧٦ز(٢٤) کـە پلەیـەک بـوو جیاووکـی گـەورەی بەخاوەنەکـەی دەبەخشـی و دەیکـردە پیـاوی دووەمـی ئـەو وڵاتـە، چونکـە قـەڵات لەژیانـی شـاری سـەتەکانی ناوەڕاسـتدا زۆر گرنـگ بـووە.

ئـەو دۆخـە نوێیـە وای لەموجاهیدەددیـن قایمـاز کردبـوو کـە هەمـوو قورسـاییەکی خـۆی بخاتـە سـەر لایەنـی

ئاشـتبوونەوە لەنێـوان موسـڵ و سـەلاحەددینی ئەیووبـی لەسـاڵی ٥٧٢ک/١١٧٧ز، کـە وای لەسـەلاحەددین کـرد سوپاسنامەیەک لەسەر ئەو هەڵوێستە بەرزەی بۆ موسڵ بنێرێ و تێیدا بەم شێوەیە بەقایمازدا هەڵبڵێ: (ئەوها بۆ میر موجاهیدەددین قایماز خوا پشتیوانیی بکا لەو هەوڵەی کە مایەی سوپاسە و کاریگەریەکەی دیارە و بازرگانیەکی بەخێری نەبڕاوەیە، لەگەڵ ئەو شێلگیریەی کە لەناو تاریکیی کاروباردا رووناکیە، بۆیە جێی سوپاسە بەزمانی چاکەکانی کە لەسەر ئەوانەی پێشتر و سوارچاکەکانی دەژمێردێن)(٢٥).

بەرزیی پایەی موجاهیدەددین قایماز لەموسڵ وای لە والیی شارەزوور(٢٦) شیهابەددین محەمەد کوڕی بۆزان کرد لەژێر سەروەریی موسڵ بچێتە دەرێ چونکە دوژمنکاریەکی پێشتری لەگەڵ موجاهیدەددین قایماز هەبوو، هەر لەڕۆژانی کە لەئەربل بوو(٢٧). بۆیە ترسان تووشی کێشەیەک بێ لەسەر دەستی، لەبەر ئەوە رەتی کردەوە لەخزمەت سەیفەددین غازیی دووەم لەموسڵ ئامادە بێ.

ئەوەش واتە دەرچوونی شارەزوور لەژێر سەروەریی موسڵ و سەرکێشیکردنێک کە موسڵ ناتوانێ لێی بێدەنگ بێ. وەزیر جەلالەددینی ئەسفەهانیی وەزیری موسڵ لەلای خۆیەوە بەپەلە نامەیەکی بۆ کوڕی بۆزان نارد و تێیدا پێویستیی ملەکەچبوون و گەڕانەوەی بۆ خزمەتی موسڵ روونکردەوە و لەهەمان کاتیشدا هۆشیاریی دایێ

لەئەنجامی ئەو سەرکێشیەی و بەرژەوەندیش وا دەخوازێ کە بگەڕێتەوە. کوڕی بۆزان باوەڕی هێنا کە سەرکێشی هیچ سوودی نابێ و دڵنیا بوو کە پێویستە بگەڕێتەوە ژێر خزمەتی موسڵ(٢٨). لەوانەیە هەر ئەو دەستوەردانە بێ کە نەیهێشت موداهیدەددین قایماز تۆڵە لەکوڕی بۆزانی دوژمنی بکاتەوە.ئەمە وای لەموجاهیدەددین کرد کە ئەو دەستوەردانەی وەزیر بەدەستێوەردان لەکاروبارە تایبەتیەکانی دابنێ، بۆیە لەئەنجامدا موجاهیدەددین قایماز کەوتە پیلانێک و لەساڵی دواتر بەو دەسەڵات و توانایەی کە لەلای فەرمانڕەوای موسڵ سەیفەددین هەیبوو وەزیری لەسەر کار لادا.

قایماز و ڕزگاربوون لەوەزیر جەلالەددین ئەلئەسفەهانی(٢٩):

لەوانەیە قایماز لەناخەوە حەزی کردبێ کە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکی موسڵدا رابگا و وای لێهات حەزی نەدەکرد رکابەرێکی هەبێ لەسەر سەروەری. ئەمەش وای لەقایماز کرد کە پلانێک دابڕێژێ بۆ لادانی وەزیر ئەلئەسفەهانی، ئەو پیاوەی کە دەیتوانی لەسەر ڕێی پرۆژە و پلانەکانی ئایندەی راوەستێ. وەزیر جەلالەددین خۆیشی لەساڵی ٥٧١ک – ١١٧٥/١١٧٦ز پەیوەندیی بەخزمەتی موسڵەوە کردبوو(٣٠) و بەوە دەناسرا کە پلەیەکی بەرزی هەیە لەزیرەکی و زانیاری لەسەر ڕێساکانی فەرمانڕەوایی و شارەزابوون لەهونەرە جۆراوجۆرەکانی کە ببووە هۆی ترساندنی موجاهیدەددین قایماز(٣١).

لەوانەیە ئەو سەرکەوتنەی لەو بوارەدا بووبێتە هۆی زۆر سەرئێشە و وروژاندنی رقی موجاهیدەددین قایمازێک کە هەمیشە ئامادەبوو بۆ کۆنترۆڵکردن و دەست بەسەرداگرتنی دەسەڵات بەبێ خەڵکی دیکە. لەوانەشە رووداوە رابردووەکەی شارەزوور ئەو چیلکەدارەبێ کە پشتی حوشتری شکاند و پاڵی بەقایمازەوە نابێ بۆ ئەوەی هەموو قورسایی خۆی بخاتە سەر سەیفەددین غازیی دووەم و قایلکردنی بەوەی کە پێویستە بەخێرایی لەدەست جەلالەددین رزگاربێ، ئەویش فەرمانی دا بە دەست بەسەرکردنی لەمانگی شەعبانی ساڵی ٥٧٣ک/ شوباتی ١١٧٨ز(٣٢). جەلالەددین لەبەندیخانەدا مایەوە هەتا کەمالەددین نیسانی وەزیری خاوەنی ئامەد، کە شارێکە لەشارەکانی دیاربەکر لەخاکی جەزیرەی فورات، پاکانەی بۆ کرد.

جەلالەددین مێردی کچەکەی بوو، بۆیە چووە ئامەد و هەر لەوێ مایەوە تا لەساڵی دواتر لە ٥٧٤ ک – ١١٧٨–١١٧٩ز کۆچی دوایی کرد(٣٣). ئەوجا تەرمەکەی گواسترایەوە بۆ موسڵ و لەوێشەوە بۆ مەدینەی منەوەرە و لەوێ تەرمەکەی لەتەنیشت تەرمی باوکی جەمالەددین ئەلجەواد ئەلئەسفەهانی جێگیرکرا.

ئەمە بەڵگەی نەتوانین و کەمتەرخەمی بوو لەلایەن سەیفەددین غازیی میری موسڵ کە بەخێرایی رەدووی ناڕاستیەکانی موجاهیدەددین قایماز کەوت کە داوای

لێکردبوو جەلالەددین بگرێ و لێی رزگاربێ، بۆ ئەوەی دەست بەسەر فەرمانڕەوایی دابگرێ. لەوانەیە ئەوەی بۆی ببێتە پاکانە لەو بوارەدا لاوازیی کەسێتیی بێ بەرامبەر موجاهیدەددین قایمازی جێگرەکەی، هەرچەند خۆی فەرمانڕوای یەکەم بوو لەوڵات و لەلووتکەی دەسەڵاتدا بوو.

---

**پەراوێزەکانی پێشەکی(١):**

١–الموسوعة العربية الميسرة ص ٨٠٠

کي ليسترنج: بلدان الخلافة الشرقي ص ١٢٠

٢–ابو الفداء: تقويم البلدان طبعة ديسلان ص ٤١٣

٣–مێژوونووسەکان زۆر لەسەر ئەوە جیاوازن کە بیدەنە پاڵ موسڵ و پێدەچێ ئەو زەنگیەی کە هەوڵیدا ئیمارەتێکی بەهێز دروست بکا بۆ ئەوەی بەرەنگاری خاچپەرستەکان ببێتەوە هەر لەوکاتەی کە لەساڵی ٥٣١ک هەڵبژێردرا و ناکرێ بۆ ماوەیەکی درێژ واز لەئەربل بێنێ بۆیە دەستبەسەرداگرتنی لەدەوروپشتی ساڵی ٥٢٢ک دا بوو. بڕوانە:

ابو شامة: كتاب الروضتين ج١ ص٣٠

الدواداري: كنز الدرر ج٦ ص١٩٧

الكتبي: عيون التواريخ ج١٢ ص١٩٧

ابن العبري: التاريخ السرياني ص ٣٠٩ مجلة المشرق عدد ٤٦ عام ١٩٥٢م.

٤–ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٤ ص٨٢

سبط الجوزي: مرات الزمان ج٨ ص٤٥٨. ابن كثير: البداية والنهاية ٢١/١٣ نعته بالرومي.

ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة ج٦ ص١٤٤

٥–سجستان: شارێکی گەورەیە لەکۆندا ناوی رام شەهرستان بووە پاشان ئەو ناوە هەرێمێکی فراوانی گرتەوە کە ژمارەیەک شاری تێدابوو. خاکێکی بەپیتی هەبوو و گرنگترین شارەکانی زالق، کەرکۆیە،

هبسووم، زرنج وبست. بڕوانە:
الحموي: معجم البلدان ج٣ ص١٩٠-١٩١.
ابن حوقل: صورة الارض ص٣٤٧ وما بعدها ويحدد الاقليم كما سبق ويضيف اسماء مدن جديدة غير ما ذكره الحموي.
ابن الاثير: الكامل ج١٢ ص٥٥-٥٦ يقول ان اصله من قرادي احدى مدن سجستان.
٦-عبدالقادر طليمات: مظفرالدين الكوكبري ص١٥.
٧-ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٤ ص٨٢
ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص٤٧
٨-ابن الاثير: الكامل ج١٢ ص٥٦ طبعة بيروت في ١٣ جزء
ابن الاثير: الباهر في تاريخ الدولة الاتابكية في الموصل ص١٣٥
ابن المستوفي: تاريخ اربل ج٢ ص٢٥.
ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٤ ص١١٤
ابن العبري: تاريخ مختصر الدول ص٢١٢
ابن واصل: مفرج الكروب ج١ ص١٥٤
ابن العماد: الحنبلي شذرات الذهب ج٤ ص٢٠٩
٩-ابن الاثير: الباهر ص١٧٧ محسن محمد حسين: اربل في العهد الاتابكي ص٦٢
٥٢٦ .Section: A History of the Crusades, u. I. P
١٠-ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٤ ص١١٤
مجهول: انسان العيون مخطوط ميكروفيلم جامعة الكويت ص٢٩٢.
١١-محسن محمد حسين: اربل في العهد الاتابكي ص٦٣ مرجع سابق
١٢-ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٤ ص١١٤
مجهول: انسان العيون ميكروفيلم مخطوط جامعة الكويت ص٢٩٢
١٣-ابن الاثير: الباهر ص١٣٦
ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب ج٥ ص١٣٨
١٤-عبدالقادر طليمات: مظفرالدين الكوكبوري ص٤٩ مصدر سابق
١٥-ابن الاثير: الباهر ص١٨٥/١٩٢
ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٣٤
ابن المستوفي: تاريخ اربل ج٢ ص٢٤ ترجمة ١٤
١٦-محسن محمد حسين: اربل في العهد الاتابكي ص٦٤-٦٥
١٧-ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٤ ص١١٤-١١٥
مجهول: انسان العيون ميكروفيلم جامعة الكويت رقم ١٣٠٣ ص٢٩٣

١٨–ابن الجوزي: المنتظم طبعة حيدر اباد الدكن ج١٠ ٢٣٢–٢٣٣
ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٣٦٠ خەلیفەی ئەوکات ئەلمەستەزی بوو و لەوکات
زۆر بێ توانا بوونەیدەتوانی هیچ پێشکەش بکا پاشان قایل بوو بەوەی کە
لەئەربل رووی‌دا و بەقایماز قایل بووبەتایبەتی کە فەرمانڕەوایی لەئەربل لەبرایەکەوە موزەفەرەددین گۆگبورو بۆ برایەکەی زەینەددین یوسفچوو.
١٩–ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٤ ص١١٥
العيني: عقد الجمان ميكروفيلم جامعة الكويت ج١٢ رقم ٦٠٤ حوادث ٥٧١ه.
محسن محمد حسين: اربل في العهد الاتابكي ص٦٦
عبدالقادر طليمات: مظفرالدين كوكبوري ص٧٠
٢٠–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٢٣٧ وما بعدها
ابن شداد: سيرة صلاح الدين الايوبي تحقيق جمال الشيال ص٥٢
ابو شامة: كتاب الروضتين طبعة دار الجيل ج١ ص٢٤٥ وما بعدها
ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص٣٩
العيني: عقد الجمان ميكروفيلم جامعة الكويت ج١٢ رقم ٦٠١ حوادث٥٧٤هـ
٢١–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٢٨ وە دەڵێ سەیفەددین رووی کردە شاخ و
خۆی تێدا شاردەوە لەترسیئەوەی سەلاحەددین هێرش بکاتە سەر موسڵ و
ئەگەر وەزیر جەلالەددینی ئەسفەهانی وموجاهیدەددین قایماز نەبوونایە هەر
لەوێ دەمایەوە..
ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص٤٠
ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر طبعة بيروت ج٣ ص٥٨
ابن الوردي: تتمة المختصر طبعة النجف العراق ج٢ ص١٢٣
٢٢–ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٤ ص٨٢
ابن تغري بردي: ابو المحاسن النجوم الزاهرة ج٥ ص٧٦
٢٣–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٢٨
ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص٤٠
٢٤–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٣٤ الباهر ص١٧٧

ابن المستوفي: تاريخ اربل ج٢ ص٢٤ ترجمة ١٤
ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٤ ص٨٢
ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص٥٨
العيني: عقد الجمان ميكروفيلم جامعة الكويت رقم ٦٠١ حوادث ٥٧٢هـ
داود الجلبي: مخطوطات الموصل مطبعة الفرات بغداد ١٣٤٦/١٩٢٧ ص٧
٢٥–البنداري: سنا البرق الشامي تحقيق فتحية النبراوي ١٩٧٩م مكتبة الخانجي
مصر.ص ١٢٢–١٢٤ يضم هذا الكتاب حوادث السنوات (٥٦٢–٥٨٣هـ)
البنداري: سنا البرق الشامي تحقيق رمضان ششن ١٩٧٠/١٩٧١م دار الكتاب
الجديد لبنان ص٢٤٧
٢٦–الحموي: معجم البلدان ج٣ ص٣٧٥ و دەڵێ: شارەزوور ناوچەیەکی فراوانی
ناو چیاکانە لەنێوان ئەربل و هەمەدان و زۆر گوندی تێدایە و خەڵکی ئەو
ناوچەیە هەموویان کوردن.
٢٧–ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٤ ص٨٢
العيني: عقد الجمان ميكروفيلم الكويت رقم ٦٠١ حوادث ٥٧٢هـ.
سەرچاوەکان هۆکاری ئەودوژمنکاریەیان روون نەکردۆتەوە تەنیا ئاماژەیان
بۆ کردووە و وابزانم بەهۆی رکابەری بووە لەسەرناوبانگ و هیچیتر.
٢٨–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٣٧–٤٣٨
ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص٥٨
العيني: عقد الجمان ميكروفيلم جامعة الكويت رقم ٦٠١ حوادث ٥٧٢هـ
٢٩–جلال الدين الاصفهاني: ئەوە جەلالەددینی ئەسفەهانیی کوڕی وەزیری
موسڵی بەناوبانگ جەمالەددینیئەسفەهانی ناسناوی خێرەوەمەند بووە
چونکە زۆر کاری خێرخوازیی کردووە. هەردووکیان لەسەردەمیدەوڵەتی
ئەتابەگی لەموسڵ بەناوبانگ بوون و جەمالەددین لەساڵی ٥٥٩ک مردووە.
٣٠–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٣٤ ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص٤٦
الذهبي: تاريخ الاسلام مخطوط الكويت ميكروفيلم جامعة الكويت رقم ١٢٦٨

ورقة ١٣١٦.

٣١–ابن الاثير: الباهر ص ١٧٧

٣٢–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٤٨

ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص ٤٦–٤٧.

٣٣–ابن الاثير: الباهر ص ١٧٧ يقول الوفاة عام ٥٧٤هـ

ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٤٨ يقول الوفاة عام ٥٧٤هـ

ئیبن ئەسیر بەهەڵەدا دەچێكە لەگێڕانەوەیەكی دیكە لە الكامل ج١١ ص٥٦٣ دەڵێ مردنی جەلالەددینلەئامەد لەساڵی ٥٨٣ك بووە بەلام لەگێڕانەوەكەی پێشتر دەڵێ لەساڵی ٥٧٤ك لەئامەد وگواستراوەتەوە بۆ موسڵ و دوایی بۆ شاری مەدینە. راستیەكەی ئەوەیە كە جەلالەددین ساڵی ٥٧٤كمردووە چونكە سەرچاوەكانی دیكە جەخت لەوە دەكەن وەكو ئیبن واسڵ و هیدیكەش.

لێرە دژبەیەكی دیكەش هەیە لەپلەی ئیبن نیسان و كەسایەتیەكەی. ئیبن ئەسیر لە الباهر دا لەلاپەڕە١٧٧دەڵێ: كەمالەددین ئیبن نیسان وەزیری خاوەنی ئامەد بووە. لە الكامل ج١١ ص٤٤٨دا دەڵێ:

ئیبن نیسان سەرۆكی ئامەد بووە (واتە فەرمانڕەواو میر) و ئیبن واسڵ جەخت لەگێڕانەوەكەی الباهردەكاتەوە و بەهەند وەری دەگرێ. لە تاريخ الاسلامی ئەلزەهبی كە دەستخەتێكە لەزانكۆی كوەیت ژمارە١٢٦٨وەرەقەی ٣١٦/أ هاتووە كە كەمالەددین بن نیسان وەزیری خاوەنی ئامەد بووە. هەروەهالەكتێبی (الروضتين)یش ج١ ص٢٦ی ئەبی شامەشدا.

لە (العقد الجمان)العيني دەستخەت ژمارە ٦٠١ حوادث ٥٧٤ك.. ئێمەش لایەنی ئەو رایەدەگرین و لەگەڵ ئیبن ئەسیر نین. ئەوانەی ئەو رایەیان پەسند كردووە لەنوێیەكان:

زامباور: معجم الاسرات ج٢ ص٢١١

رشيد الجميلي: دولة الاتابكة في الموصل بعد عمادالدين زنكي ط٢ ص٢٤١ عام ١٩٧٤م دار النهضة بيروت لبنان.

عصام الدين عبدالرؤوف: بلاد الجزيرة اواخر العصر العباسي ص ٢٢٦.

(٢)

## موجاهیدەددین قایماز لەسەردەمی مەسعوودی میری موسڵ(١) ٥٧٦-٥٨٩ک/١١٨٠-١١٩٣ز

سەیفەددین غازیی دووەم پەیمانی فەرمانڕەواییی ئیمارەتی موسڵی لەدوای خۆی دابووە عیزەددین مەسعوودی برای. حەزیشی دەکرد پەیمانەکەی بداتە نەسرەددین سینجەرشای کوڕی کە تەمەنی دوازدە ساڵ بوو. هیچ ڕێگریەکیش نەبوو بێجگە لەبارودۆخی شلۆقی مووسڵ، چونکە دەبوایە بەرامبەر سەلاحەددین بوەستێتەوەو کوڕەکەشی ئەو توانایەی نەبوو کە بەرگەی ئەو هەڵوێستە بگرێ(٢).

پاشان بۆ ئەو ڕێگریە، ئاستەنگی دیکەشی هاتەسەر کە ناچاریان کرد لەبەر ئەوانە سەیفەددین پەیمانەکەی لەجیاتی کوڕەکەی بداتە برایەکەی، لەوانەش: عیزەددین مەسعوود زۆر بەتوندی بەرامبەر حەزەکانی برایەکەی وەستابۆوە لەو پەیماندانەی بەکوڕە گچکەکەی و بەتوندی داوای کورسیی دەسەڵاتی مووسڵی بۆ خۆی دەکرد، چونکە باوەڕی وابوو کە خۆی بەڕەواتر بۆ ئەو فەرمانڕەوایەتیە دەزانی لەبەر بەتەمەنیەکەی، لەسەر نەریتی گەلانی تورک. پاشان هەر ئەویش توانای پاراستنی سنووری وڵاتی هەبوو و دەیتوانی لەڕووی ئەوانەوە بوەستێتەوە کە چاویان تێبڕیبوو، بۆ نموونە: سەلاحەددین و هیدیکەش(٣).

ئەوە، سەرباری حەزی میرەکانی سەیفەددین غازی و لەسەرووی هەموویشیانەوە موجاهیدەددین قایماز، بۆ

جێگرتنـــەوەی کورســـیی دەســـەڵاتی ئەتابەکیەزەنگیەکانـــی موســـڵ لەلایـــەن عیزەددیـــن مەســـعوودەوە، چونکـــە ئـــازا و بەتوانـــا بـــوو و کاروبارەکانیشـــی بەباشـــی بەڕێـــوە دەبـــرد. لەبـــەر ئـــەوە ئـــەو میرانـــە پێشـــنیازیان کـــرد کـــە هـــەردوو کوڕەکانـــی ســـەیفەددین غـــازی دەســـەڵاتی بەشـــێکی وڵات وەرگـــرن لەژێـــر چاودێریـــی مامیـــان، بۆیـــە سینجەرپاشـــا جەزیـــرەی ئیبـــن عومـــەری درایـــێ و ناســـرەددین کوشـــکیش قەڵاتـــی عەقـــەری حەمیدیـــە و شووشـــی بەرکـــەوت(٤).

بـــەم شـــێوەیە تـــای تـــەرازووی عیزەددیـــن مەســـعوود بەیارمەتیـــی موجاهیدەددیـــن قایمـــاز ســـەنگینتر بـــوو وب نەماڵەیزەنگیشـــقایلکرانوکۆیدەنگی میرەکانیشـــی لەســـەر بـــوو. لـــەو کاتـــەدا تـــای تـــەرازووی نەســـرەددین سینجەرشـــا لاســـەنگ بـــوو.

ئـــەوە بـــووە مـــاڵ بەســـەر عیزەددیـــن کـــە دەبـــێ فەرمانڕەوایەتیەکـــە بـــکا کاتێـــک کـــە برایەکـــەی دەمـــرێ. ئـــەوەش لـــە ٣ی مانگـــی ســـەفەری ســـاڵی ٥٧٦ک/٢٩ی مانگـــی حوزەیرانـــی ســـاڵی ١١٨٠از روویـــدا(٥).

کاروبارەکانـی بەبـێ پشـێوی بەڕێوەچـوون و موجاهیدەددیـن قایمـــاز بـــووە سەرمەشـــق و دەســـەڵات بەدەســـت، بەمـــەش سەرکێشـــی و حەزەکانـــی هاتنـــە جـــێ. لێـــرەوە بۆمـــان دەردەکـــەوێ کـــە کەســـایەتیی قایمـــاز توانـــای ئـــەوەی تێدابـــوو کـــە کاروبـــارەکان بجوولێنـــێ و بـــەو ئاڕاســـتەیان ببـــا کـــە خـــۆی دەیـــەوێ(٦).

بەڵام ئەو سیاسەتە چیە کە قایماز بەتەمایە لەگەڵ سەلاحەددین پەیڕەوی بکا؟ ئەو کەسەی کە جار ناجارێک دەیەوێ مووسڵ بخاتە ژێر رکێفی خۆی و بیباتە ناو بەرەی یەکگرتووی ئیسلامی بۆ بەرپەرچدانەوەی خاچپەرستی دوژمن.

سەرچاوە بەردەستەکان نیشانی دەدەن کە سەلاحەددینی ئەیووبی لەنزیک رووباری کۆک(٧) لەسەر سنووری سەلجووقیە رۆمیەکان چادری هەڵدابوو لەو کاتەی کە عیزەددین مەسعوود چووبووە سەر کورسیی دەسەڵات لەمووسڵ. موجاهیدەددین قایماز نامەبەرێکی لەلای خۆیەوە بۆ دەنێرێ و بەنامەبەرەکەی دەڵێ کە زۆر پێویستە دانووسان لەگەڵ سەلاحەددین بکرێ و دەبێ ببێتە پێناوێک بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵە وڵاتەی لەژێر دەسەڵاتی مووسڵە لەسەردەمی سەیفەددین غازی بمێننەوەو بکەونە ژێر دەسەڵاتی خۆی لەو رۆژانەی کە عیزەددین مەسعوود فەرمانڕەوایە. ئەو وڵاتانەش ئەوانە بوون: (سرووج، ئەلڕەها، ئەلڕەقە، حەڕان، ئەلخاپوور، نوسێبین). بەڵام دانووسانەکە سەری نەگرت لەبەر پێداگریی سەلاحەددین لەسەر گەڕانەوەی ئەو وڵاتانە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی. ئەو وڵاتانە کاتی خۆی درابوونە سەیفەددین غازی بەفەرمانی خەلیفەی عەباسی بەو مەرجەی بەهەموو توانایەکیانەوە یارمەتیی سەلاحەددین بدەن بۆ ئەوەی بتوانێ لەبەرامبەر دوژمنی خاچپەرست بوەستێتەوە(٨).

بەڵام کە سەیفەددین غازیی دووەم مرد، سەلاحەددین بۆ خەلیفەی عەباسیی نووسی و پێی راگەیاند کە ئەو وڵاتانە بەپشتیوانیی خۆی بەهێزتر دەبن لەبەرامبەر خاچپەرستەکان، بۆیە وای لەخەلیفە کرد کە کاروبارەکانی بداتە دەستی و بگرە مافی هەڵسووڕاندنی تەواویشی دایە دەستەخۆی(٩).

نامەبەری موجاهیدەددین قایماز بۆ سەلاحەددین شێخی فەقێیەکان فەخرەددین ئەبو شوجاعی کوڕی ئەلددەهانی بەغدادی بوو کە کۆپیەک لەو سوێندەی پێبوو کە لەلایەن سەلاحەددین خۆیەوە بۆ سەیفەددین غازی مۆرکرابوو بەوەی کە هێرش ناکاتە سەر سەیفەددین و برایەکانی یان جێگرەکانیتایبەت بەو وڵاتانە و گوتبووی: (ئەوە ئەو برایەتە کە سوێندت خواردبوو هێرشی نەکەیە سەری، ئەوە بە چ لێکدانەوەیەک دەتەوێ دەست بەسەر ئەوەدا بگری کە لەدەست ئەودایە)(١٠).

سەلاحەددینیش وەڵامی دەداتەوە: (هەرچی ئەو سوێندەیە ئەوا پەیوەستە بە بەردەوامبوونی ژیان و ناچارمان ناکا کە دوای مردنیش پێیەوە پابەندبین. ئێمە رای خۆمان هەیە لەسەر ئەوەی کە دەیکەین لەکاروبارەکاندا و بەئاگاداریی دیوانی پێغەمبەرایەتیی خۆشەویست، خودا پشتیوانیی بکا لەسەرکەوتن. لەوەشدا لەژێر فەرمانی ئەوداین)(١١).

لەڕاستیدا سەلاحەددین لەو رەفتارەی لەسەر حەق

بوو، چونکە ئەو پەیمانی دابوو بەوەی کە دەبێ ئەو وڵاتانە لەلای سەیفەددین غازی و برایەکانی بمێننەوە نەک دوای مردنی، بەڵکو تەنیا لەژیانیدا. پەیمانەکەشی کە بەخودای دابوو بەجێی گەیاند. پاشان مافی بەخۆیدا کە بجوولێتەوەو بەشێوەیەک کاربکا کە بەگونجاوی دەزانێ، دوای ئەوەی پەیوەندیی بەخەلیفەی عەباسیەوە کرد. وەڵامی خەلیفەش، وەکو روونمان کردەوە، ئەرێنی بوو: دەبێ ئەو شوێنانە بۆ سەلاحەددین بگەڕێنرێنەوە بۆ ئەوەی لەبەرامبەر خاچپەرستەکان پێیانەوە بەهێز بێ، ئەوەش واتە بڕیاری خەلیفەیە و قایل بوونیەتی لەسەر ئەوەی سەلاحەددین فەرمانڕەوایی ئەو لایەنانە بکا و لەبەرژەوەندیی خۆی بەکاریان بێنێ. ئەمەش لەگەڵ سیاسەتەکەی سەلاحەددین رێک دەهاتەوە کە دەیویست کۆنترۆڵی ئەو وڵاتانە بکا و لەژێر دەسەڵاتی موسڵیان دەربێنێ بۆ ئەوەی پاڵپشتێک بن بۆی لەدژی خاچپەرستە هێرش بەرەکان(١٢).

بۆ ئەوەی سەلاحەددین سیاسەتکردنە باشەکەی بسەلمێنێ و قایماز و موسڵ شەرمەزار بکا، هەموو کارەکەی دایە دەست خەلیفەی عەباسی دوای ئەوەی بۆی نووسیبوو و لەنووسینەکەیدا بۆی روون کردبۆوە کە چ دەستکەوتێکی هەبووەو چ ئاستەنگێکی لەبەردەمدا بڕیوەو چ جیهادێکی لەجیاتی موسڵمانان بەتەنیا کردووە بەرامبەر بەخاچپەرستی دوژمنکار. وە هەموو ئەوانەشی بەکۆڵی

خۆیدا داوە لەجیاتی هەموو فەرمانڕەوایان، موسڵمانانی وەک فەرمانڕەوای موسڵ و هیدیکەش. بۆیە خۆی پێ لەپێشترە کە بەو وڵاتانەوە بەهێزتر بێ کە جێی ناکۆکین لەنێوان خۆی و موسڵ و قایماز. بەتایبەتیش کە ئەو میسرەی کە بەسەرچاوەیەکی سەرەکی دادەنرێ بۆ هێزە شەڕکەرەکانی ئەیووبی کە لەهەموو لایەکیشەوە ئێستا دوژمن بۆیان لەسەنگەردان(١٣).

ئەوەی جێی ئاماژەیە وەڵامی خەلیفە، وەکو روونمان کردەوە، ئەرێنی بوو بەوەی کە موڵکداریی ئەو وڵاتانەی ناکۆکی لەسەرن لەگەڵ مووسڵ، دایە سەلاحەددین. ئەو موڵکداریە لەو کاتەدا گەیشتە دەستی لەگەڵ لابردنی تەشریف لەمانگی رەجەبی ساڵی ٥٧٥ک/تشرینی دووەم- کانوونی یەکەمی ساڵی ١١٨٠ز بەدەستی شەهابەددین بەشیر ئەلجاس و شێخی شێخان ئەبیل قاسم عەبدولڕەحمان(١٤).

دوای ئەوەی سەلاحەددین دڵنیا بوو لەبەڕێوەچوونی کارەکان بەو شێوەیە، لە ١٨ی مانگی رەجەب ٩ی کانوونی یەکەم١١٨٠ز گەڕایەوە میسر و لە ١٣ی شەعبانی ساڵی ٥٧٦ک/٣ی کانوونی دووەمی ١١٨١ز گەیشتەوە میسر(١٥). لەگەڵ ئەو هەمووەدا موجاهیدەدیین قایماز هەر کاری لەسەر بەهێزترکردنی بەرەکەی دەکرد لەمووسڵ لەبەرامبەر ئارەزووەکانی سەلاحەددینی ئەیووبی و هیدیکەش.

**پەراوێزەکانی(٢):**

١–ابن ایوب (شاهنشاهـ): منتخبات من تاریخ صاحب حماة ص٢٧٧.

ابـن شـداد: الاعـلاق الخطیـرة. وزارة الثقافـة. سـوریا عـام ١٩٧٨م ج٣ق١ص ٢٧٧.

ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر ج٣ ص٦٢.

الذهبي: دول الاسلام ج٢ ص٨٩.

٢– ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ص٩٣.

الملك الغساني: المسجد المسبوك ص١٨٠.

٣– ابن العبري: تاريخ مختصر الدول ط٢ ص٢١٨.

ابن شداد: الاعلاق الخطيرة ج٣ق١ص٢٢٨.

٤–سبط ابن الجوزي: مراة الزمان ج٨ق١ ص٣٦٤.

= جزیـرة ابـن عمـر: شـارۆچکەیەکە لەسـەرەوەی موسڵ مـاوەی نێوانیـان بەپـێ ٣ رۆژە. ئـەو شـارۆچکەیە ژمارەیـەک گونـدی بەپیتـی هەیـە. زێـی دیجلـە لەهەمـوو لایەکـەوە دەورەی داوە تەنیـا لایـەک نەبێ کـە وەکو نیمچـە مانگێکـی کەوانەیـی وایـە، بـەڵام دانیشـتووانەکەی لەولایەشـەوە کەندێکیـان هەڵکەنـدووە و ئـاوی بەنـاودا دەڕوا بۆیـە بۆتـە دوورگـە (جزیـرە). بڕوانـە: مراصـد الاطـلاع ١/٣٣٣.

عقـر الحمیدیـة: قەڵاتێکـی تونـدو قایمـە لەچیایەکانـی موسـڵ لـەلای رۆژهەڵاتـە. بڕوانـە: ابـن عبدالحـق: مراصـد الاطـلاع ٢/٩٥٠.

الشـوش: قەڵاتێکـی زۆر بـەرزە لەنزیـک عقـر الحمیدیـە سـەر بەموسڵە و لەعقـر بەرزتـر و گەورەتـرە بـەڵام لەتوانـا لاوازتـرە. بڕوانـە: ابـن عبدالحـق: مراصد الاطلاع ٢/٨١٩. الحمـوي: معجـم البلـدان ٣/٣٧٢.

٥–ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص٩٢.

جب (هاملتون): صلاح الدين الايوبي ص١٣٤.

.Stevenson: The Crusades. P. 223

٦–ابـن ایـوب (شاهنشـاهـ): منتخبـات مـن كتـاب التاریـخ لصاحـب حمـاة ص٢٧٧.

٧–کـوک سـو: زێـی شـین کـە دەکەوێتـە نێـوان بهنـا و قەڵاتـی مەنسـوور کـە ئـەوڕۆ لەتورکیـا دایـە.

٨–البنداري: سنا البرق الشامي. تحقيق رمضان ششن ص٣٥٧.

ابو شامة: كتاب الروضتين ج٢ ص١٧.

ابن كثير: البداية والنهاية. ج١٢ ص٣٠٥.

ئیبن کەسیر دەڵێ: نامەی خەلافەت بۆ سەلاحەددین هات بۆ ئەوەی ئەو وڵاتە بەدەستی عزەددین مەسعوودەوە بمێنێتەوە بەڵام رەتی کردەوە لەبەر بێهێزیی خەلافەت و لەبەر گرنگیی ئەو وڵاتانە بۆ ئەو لەکاتی ململانێی لەگەڵ موسڵدا و بەسەرچاوەیەکی هێز دادەنرا بۆ ئەو. بەڵام هێشتنەوەی بەدەستی سەیفەددین غازیی دووەم بەو هیوایەی یارمەتیی بدا بەڵام ئێستا عزەددین مەسعوود یارمەتیی نادا.

العيني: عقد الجمان مخطوط ميكروفيلم جامعة الكويت رقم ٦٠١ ج١٢ حوادث ٥٧٦.

.Stevenson: The Crusades. P. 223

٩–سبط الجوزي: مراة الزمان ج٨ ق١ ص٣٦٥.

.Selton.Op.Clt. Vol. 1 P. 575

١٠ –البنداري: سنا البرق الشامي تحقيق ششن ص٣٥٧.

= عقد الجمان ميكروفيلم جامعة الكويت ج١٢ حوادث ٥٧٦هـ.

١١–الايوبي: (محمد بن تقي الدين) مضمار الحقائق تحقيق حسن حبشي عالم الكتب. القاهرة. ص٤٣–٤٤.

دەڵێ: وەرگرتنی دەسەڵات لەلایەن عزەددینەوە دوای سەیفەددین بەپەیمانی ئەو نەبوو بەڵکو بەفرتوفێڵ بوو. ئەوەش جێی سەرسوڕمانە چونکە ئەوەی سەلمێندراوە بەپەیمان بووە.

١٢–ابو شامة: كتاب الروضتين ج٢ ص١٧

.Selton.Op.Clt. Vol. 1 P. 575

١٣–ابو شامة: كتاب الروضتين ج٢ ص١٧

ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص٩٤.

١٤–البنداري: سنا البرق الشامي تحقيق ششن ص ٣٥٢–٣٥٤

المقريزي: السلوك ج١ق١ص٧٠

.Selton.Op.Clt. Vol. 1 P. 575

١٥–الايوبي (محمد بن تقي الدين) مضمار الحقائق ص٥٣.

ابو شامة: كتاب الروضتين ج٢ ص١٩.

## (٣)

## رۆڵی قایماز لەرووداوەکانی دوای مردنی پاشای چاکەکار ئیسماعیل کوڕی نورەددین مەحموود لەحەلەب ساڵی ٥٧٧ک/١١٨١ز

پاشای چاکەکار ئیسماعیل کوڕی نورەددین مەحموودی خاوەنی حەلەب وەسیەتی کردبوو موڵکەکانی دوای مردنی خۆی بۆ عیزەددین مەسعوودی کوڕی مامیی خاوەنی موسڵ بێ، هەرچەندە بەشی زۆری میرەکانی پێیان وابوو کە عیمادەددین زەنگی کوڕی قوتبەددین مەودوودی برای عیزەددین خۆی خاوەنی شەنگال و زاوای پاشای چاکەکار ئیسماعیلیان پێ شایانتر بوو(١).

کاتێک چاکەکار لە ٢٥ی ڕەجەبی ساڵی ٥٧٧ک/٤ی کانوونی یەکەم ١١٨١ز گەڕایەوە لای خودا، میرەکانی حەلەب بەدوای عیزەددین مەسعوودیاندا نارد و داوایان لێکرد بێتە حەلەب و فەرمانڕەوایی بگرێتە دەست وەکو جێبەجێکردنێک بۆ وەسیەتەکەی پاشای چاکەکار ئیسماعیل(٢).

بەڵام بۆچی پاشای چاکەکار لەناو ئەوانی دیکەدا عیزەددین مەسعوودی هەڵبژارد؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین: ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە عیزەددین مەسعوود بەئازایەتی و بەهێزیی ناسرا بووو هەر لەساڵی ٥٧٠ی کۆچیەوەبەیەکێک لەدیارترین دوژمنەکانی سەلاحەددین دادەنرا، لەو کاتەی کە لەدژی پڕۆژەکانی لە قرروونی حەما و تەل ئەلسوڵتان وەستایەوە. لێرەوە

دەبینین ئەوە عیزەددین مەسعوودە کە دەتوانێ لەبەرامبەر سەلاحەددین بوەستێتەوە و موڵکەکانی زەنگی لەحەلەب و مووسڵ بپارێزێ(٣).

ئەوەش زێدەڕۆیی نیە کە دورەید نووری(٤) لەکاتی قسەکردن لەسەر پەیوەندیی سەلاحەددین بەمووسڵەوە ناوی دێنێ، چونکە ئەتابەکیە زەنگیەکان بەڕاستی بڕیاریان دابوو کە بەرامبەر سەلاحەددین بوەستنەوە لەشام و جەزیرە و موڵکەکانی خۆیان لەچاوتێبڕینەکانی بپارێزن. کەواتە هیچ سەیر نیە کە پاشای چاکەکار ئیسماعیل پەیمانی فەرمانڕەوایی حەلەب و بەشەکانی سەر بەوێ بداتە عیزەددین مەسعوودی کوڕی مامی.

هەرچۆنێک بێ هەواڵی میرەکانی حەلەب دەگاتە عیزەددین مەسعوود بۆ دەست بەکاربوونی فەرمانڕەوایی لەو کاتەی کە موجاهیدەددین قایماز بەخۆی و سوپایەکەیەوە بەرەو بەرەکانی ماردین لەدیار بەکر لەخاکی جەزیرەی فورات دەڕۆیی و کە گەیشتە نامەبەری حەلەبی ناردراو بۆ مووسڵ، یەکسەر بەرەو فورات رۆیی و داوای عیزەددین مەسعوودی کرد کە لەمووسڵ بوو و هانی دا پەلە بکا. کە هەواڵەکە گەیشتە عیزەددین مەسعوود، بەخێرایی لەمووسڵەوە چووە فورات، لەو شوێنەی قایماز سوپایەکەی لێ دانابوو و لەگەڵی کۆبۆوە.

پلانی قایماز وابوو کە عیزەددین بانگی میرەکانی

حەلەب بكا بۆ ئەوەی لەسەر فورات بیگەنێ لەترسی ئەوەی نەوەكو جۆرە فێڵێك لەگۆڕێ بێ، ئەوەش وەك خۆپارێزیەك. بەڵگەش بۆ ئەوەی كە قایماز زانایی سیاسیی هەبووەو توانای ڕێكخستنی كارەكانی بەهێز بووە بۆ خۆ دوورخستنەوە لەمەترسیان، بەوەش گارەنتیی لایەنگرانی حەلەبیەكانی بۆ خۆی و سەرۆكەكەی ڕاگرتبوو(٥).

لێرەدا ئەو بەڵگەیە بەڕوونی دەردەكەوێ بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەو گوتەیەی كە دەڵێن گوایە عیزەددین مەسعوود پیلانی بۆ پاشای چاكەكار ئیسماعیل داڕشتووەو ویستوویەتی لەناوی ببا. ئەگەر پیلانێك هەبوایە ئەوا عیزەددین بەپەلە یەكسەر دەچووە حەلەب بەبێ ئەوەی لەسەر فورات چاوەڕێ بكا و بەدوای میرەكانی حەلەبیدا نەدەنارد بۆ دڵنیابوون لێیان، یان بەلای كەم جێگرەكەی موجاهیدەددین قایمازی دەنارد بۆ بەدواداچوونی كارەكە و بۆ هێوركردنەوەی كێشەكان بەخێرایی، تا ئەو كاتەی ئامادە دەبێ و بەخۆی دەچێتە ناو حەلەب.

وە لەبەر ئەوەی ئەمەی نەكرد، ئەوا تۆمەتی پیلانگێڕانەكە ڕاست نیە و پێویستیی بەپشتگیریەكی بەهێز هەیە.

كاتێك كە شاندی میرەكان گەیشتە لای عیزەددین، دەنگیان دایێ و ئەویش لەگەڵیان چووە ناو حەلەب.

بەڵام زۆری نەبرد کە بەشەنگال و خابوور و نوسێبینی گۆڕیەوە لەگەڵ عیمادەددین زەنگیی برای. ئەمەش بەبەڵگەی تەواو تۆمەتی پیلانگێڕانەکەی لەخۆی یان لەموجاهیدەددینی جێگرەکەی دوور دەخاتەوە.

هەموو سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە عیزەددین مەسعوود زۆر لەحەلەب نەمایەوە بەڵکو گەڕایەوە موسڵ. لەو کاتەی کە لەڕێگادابوو لەنزیک رەققە، نامەبەری عیمادەددین زەنگیی دووەمی برای گەیشتێ کە خاوەنی شەنگال بوو، زۆر داوای لێکرد کە عیمادەددین حەلەب وەرگرێ لەبەرامبەر وازهێنانی لەشەنگال و دەورووپشتەکەی بۆ برایەکەی لەموسڵ، بەڵام یەکەمجار عیزەددین ئەم داوایەی رەت کردەوە پاشان پەشیمان بۆوەو پێی قایل بوو(٦).

ئێمە بۆمان هەیە بپرسین: ئەو بارودۆخە چی بوو کە وای لەعیزەددین کرد حەلەب رادەستی عیمادەددین زەنگیی برای بکا لەبەرامبەر شەنگال و پاشکۆیەکانی؟

گرنگترین ئەو هۆکارانە، بەبینینی ئێمە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە عیمادەددین زەنگیی دووەمی برای عیزەددین مەسعوود، لەناخی خۆیەوە بڕوای وابوو کە خۆی پێ لەعیزەددین مەسعوودی برای شایانترە بۆ فەرمانڕەواییکردنی زەنگیەکان لەشام و جەزیرەدا. ئەوەش کاتیخۆی فەرمانڕەوایی مووسڵی پێشوو سەیفەددین غازیی دووەم لەساڵی ٥٧٠ی کۆچی رەتی

کردبووە. ئەمە وای لە عیمادەددین کرد کە لایەنی سەلاحەددین بگرێ لەململانێیەکەی لەگەڵ بنەماڵەی زەنگییەکان لەوکاتەدا. هەر ئەوەش سەیفەددین غازیی دووەمی برای کە فەرمانڕەوای موسڵ بوو ناچار کرد کە دوژمنکاریی بکا و بیگەڕێنێتەوە ناو جغزی دەوڵەتی زەنگییەوە. ئەویش ئێستا ئامادەیە و بگرە زۆریش بەپەرۆشە بۆ تەواوکردنی ئەو کارەی، تەنانەت ئەگەر بەپشتیوانیی سەلاحەددینی ئەیووبیش بێ کە دوژمنی زەنگییەکان وە عیزەددین مەسعوودیشە.

هەروەها لەتەواوی ئامادەباشیدایە بۆ چوونە ناو ریزەکانی سەلاحەددین. لەهەمان کاتیشدا لەبەرامبەر ئەوەدا داوای کۆنترۆڵکردنی حەلەب دەکا. عیزەددین مەسعوود بینی بەرژەوەندیەکە وا دەخوازێ کە بەقسەی برایەکەی بکا و وەڵامی داواکاریەکەی بداتەوەو دەست لەحەلەب هەڵبگرێ بۆی(٧).

لەوەش پتر میرە گەورەکان، لەسەرووی هەمووشیانەوە موجاهیدەددین قایماز، حەزیان دەکرد لەحەلەب و ئەو پابەندبوونانەی رزگاریان بێ کە بارودۆخەکە سەپاندبوویە سەریان لەبەرامبەریدا.

دیارە قایمازیش پێی باشتر بووە کە لەموسڵ بمێنێتەوە بەو مەرجەی حەلەبیشی بخاتە سەر. ئەمەش بەتەواوی بۆمان روون دەکاتەوە کە قایماز بەهەر هۆکارێک بێ نەیتووانیووە لەتەک موسڵدا،

حەلەبیش لەدەست بگری. ئەمەشیان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بڕوای وابووە سەلاحەددین، زوو بێ یان درەنگ، دەست بەسەر حەلەبدا دەگری، بۆیە لەسەری پێویستە پایەکەی خۆی لەموسڵ بپارێزێ و لەحەلەب و کێشەکانی دوور بکەوێتەوە. ئەمە وای لێکرد هانی عیزەددین مەسعوود بدا داوایەکە قبووڵ بکا و حەلەب بەشەنگال بگۆڕێتەوە(٨).

بەم شێوەیە ئەم گۆڕینەوە دۆڕاوە، وەکو ئیبن ئەسیر ناوی دەنێ، تەواو بوو و عیزەددین گەڕایەوە موسڵ و بەهاوڕێیەتیی جێگرەکەی موجاهیدەددین قایماز لە١٩ی مایسی ١١٨٢–١٢ی موحەڕەمی ٥٧٨ی کۆچی چووە ناوشار(٩).

ئیبن شەدداد(١٠) ئەوەندەشی دەخاتە سەر: کە عیزەددین دڵنیا بوو کە ناتوانێ شام و موسڵ پێکەوە بپارێزێ، چونکە مانەوەی لەشام ناچاری دەکا لەدژی پڕۆژە یەکگرتنەکانی سەلاحەددین بوەستێتەوە کە دەیەوێ موڵکەکانی موسڵ و زەنگیەکان بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. ئەمەش ئەوکات بەلای کەم ویستی ئەو نەبوو. پاشان میرەکانی حەلەب داوایان لێکرد مووچەکانیان پتر بکا، بەتایبەتی کە خۆیان وادەبینی وەکو خاوەن چاکەبن بەسەریەوە، چونکە دەنگیان دابووێ بۆ وەرگرتنی حەلەب. بەمەش دڵی گوشرا بوو و جێگرەکەشی ئەوکات وەکو خۆی بێنی تەنگ

بیـوو، لەبـەر ئـەوەی لەسـەر گۆڕینەوەیەکـی لـەم جـۆرە ڕانەهاتبـوو، بۆیـە زۆریـی لێکـرد بگەڕێتـەوە موسـڵ و گۆڕینەوەکـە تـەواو بـکا(١١).

هەرچـی ئەلئەسفەهانیشـە(١٢) لـەو بارەیـەوە بەمـە ڕای خـۆی دەردەبـڕێ و دەڵـێ: (پاشـان «عیزەددیـن» زانـی کـە «حەلـەب»ی بـۆ سـەقامگیر نابـێ، بۆیـە وای لەعیمادەددیـن زەنگیـی بـرای خاوەنـی شـەنگال کـرد کـە لەجیاتـی حەلـەب قەرەبـووی بکاتـەوەو ئەویـش مەیلـی لێبـوو و حـەزی دەکـرد).

هەرچۆنێک بێ، لەوانەیـە عیزەددیـن لەگـەڵ میرەکانـی حەلـەب ناکـۆک بووبـێ، دوای ئـەو داوایـەی پترکردنـی مووچەکانیـان و زۆرییـان لێیکـرد کـە هێـرش بکاتـە سـەر موڵکەکانـی سـەلاحەددین لەشـام و ئەویـش ڕەتـی کـردەوە. لەوانەیـە وابـێ، بـەڵام دەسـت تێوەردانـی موجاهیدەددیـن قایمـاز لەتـەک تەواوکردنـی گۆڕینەوەکـەش کاریگەریەکـی گەورەیـان هەبـوو بـۆ ئـەوەی وا لەعیزەددیـن بکـەن، هەرچەنـدە پێشـی خـۆش نەبـووە، بـەرەو مۆرکردنـی گۆڕینەوەکـە بچـێ دوای ئەوەی دڵنیابـووە کـە عیمادەددیـن زەنگیـی بـرای، دوورنیـە بووبێتـە لایەنگـری سـەلاحەددین(١٣). بۆیـە ویسـتی بـۆ لای خـۆی ڕایبکێشـێ، پاشـان لەکۆتاییـدا عیزەددیـن لـەلای گرنـگ نەبـووە کـە حەلـەب لەگـەڵ ئـەو بـێ یـان لەگـەڵ عیمادەددیـن زەنگـی، چونکـە عیمادەددیـن زەنگـی ئامـادە

بووە بەرامبەر سەلاحەددینی ئەیووبی بوەستێتەوە لەململانێیەکانی لەسەر موسڵ و زەنگیەکان. ئەوەش پتر لەگەڵ قسەکانی ئیبن ئەسیر یەک دەگرێتەوە، نەک قسەکانی ئەلئەسفەهانی و ئیبن شەددادی کە پێشتر گوتران.

---

**پەراوێزەکانی(٣):**

١-ابن الاثير:الكامل ج١١ ص ٤٧٢-٤٧٣

شاهنشاه بن ايوب: منتخبات من كتاب التاريخ لصاحب حماة ص٢٧٨

ابن شداد: سيرة صلاح الدين الايوبي تحقيق الشيال ص٥٥

ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٥ ص٢٠٤

ابن العباد الحنبلي: شذرات الذهب ج٤ ص٢٥٨

Stanly LausPoole:Saladin. P. 165

٢-ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١٠٨

الحموي (ابو الفضائل): التاريخ المنصوري، نشر موسكو ص١٨٦: وە بەهەڵە دەڵێ: مردنی پاشای چاکەکار ئیسماعیل ساڵی ٥٧٦ک بووە جیاواز لەهەموو هاوسەردەمەکانی.

٣-ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٧٣-٤٧٤

ابن الاثير: الباهر ص ١٨٢-١٨٣

٤-دريد نوري: سياسة صلاح الدين الايوبي الخارجية ص٢٠٠-٢٠١

٥-ابو شامة: كتاب الروضتين ج٢ ص٢٢. لەئەبو شەددادەوە دەگێڕێتەوەو ئەبو شەدداد دەڵێ: عیزەددین مەسعوودی میری موسڵ لەسەلاحەددین ترسا و خێرا چووە حەلەب و موزەفەرەددین گۆکبوروو و خاوەنی سرووجی نارده لای و لەگەڵ ئەوانەدا ئەو میرانەشی نارد کە سوێندیان بۆ عیزەددین خواردبوو لەحەلەب.

ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١٠٨.

٦-ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٧٤

ابن شداد: الاعلاق الخطيرة ج٣ق١ص٧٧

الملک الغساني: المسجد المسبوک ص١٨٤
٧–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٧٤
ابن شداد: المصدر السابق
العيني: عقد الجمان ميكروفيلم جامعة الكويت ج١٢ رقم ٦٠١ حوادث ٥٧٧هـ
٨–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٧٤
٩–شاهنشاهـ بن ايوب: منتخبات من تاريخ صاحب حماة، ذيل سيرة صلاح الدين لابن شداد. طبعة المؤيد بمص ص٢٧٩.
ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر ج٣ ص٦٣ طبعة دار الثقافة بيروت لبنان وايار هو شهر مايو.
١٠–ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١٠٩–١١٠
الملک الغساني: المسجد المسبوک ص١٨٤
S. L. Poole.Saladin. P. 165
١١–ابو شامة: كتاب الروضتين ص٢٢ ج٢
سبط ابن الجوزي: مراة الزمان ج٨ق١ص٣٦٧
ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٥ ص٢٠٤
١٢–ابو شامة: كتاب الروضتين ج٢ص٢٣
١٣–العيني: عقد الجمان ميكروفيلم جامعة الكويت ج١٢ رقم ٦٠١ حوادث ٥٧٧هـ

(٤)

## پەیوەندیی قایماز بەموزەفەرەددین گۆگبورو دوای مردنی پاشای چاکەکار ئیسماعیل:

پێشتر گوتمان کە موزەفەرەددین گۆگبورو دوای توورەبوونی لەموجاهیدەددین قایماز لەئەربل چووە دەرێ و بەناو ولاتادا گەڕا هەتا لەکۆتاییدا لەسێبەری خاوەنی موسڵ و میرەکەی سەیفەددین غازیی دووەم گیرسایەوە، ئەوەی کە حەڕانی بۆ دابڕی و تێیدا جێگیربوو. پاشان لەبەر ئەوەی لەژێر پارێزگاریی موسڵ بوو، بارودۆخ موزەفەرەددین گۆگبورووی ناچار کرد کە لەتەک سوپایەکەی لەدژی سەلاحەددین بجەنگێ لەململانێیەکەی لەگەڵ زەنگیەکاندا لەو ماوەیەی نێوان ساڵی ٥٧٠ک - ١١٧٤/١١٧٥ز و ساڵی ٥٧٨ک/١١٨٢ز، بەتایبەتیش لەهەردوو شەڕەکەی قرون حەما و تەل ئەلسوڵتان وەکو موڵکێکی پاشکۆ(١).

پاشان وا رێکەوت کە سەیفەددین غازی لەئەربلەوە بانگهێشتی موجاهیدەددین قایمازی کرد بۆ خزمەتکردنی ولاتەکەی لەموسڵ لەمانگی زیلحیجەی ساڵی ٥٧١ک. بەمەش وای لێهات دەسەلاتێکی فراوانی لەدەستدابێ وەکو جێگری قەلات و سەرۆکی سوپای زەنگی و بگرە لەوەش نزیک ببۆوە ببێتە خاوەن قسەی خۆی لەموسڵ و موڵکەکانی و لەساڵی ٥٧٦ک/١١٨٠ز(٢) دەسەلاتی گەیشتە لووتکە.

لێرەدا موزەفەرەددین باوەڕی وابوو کە ئەوە واتای کۆتاییەکەیەتی، بۆیە دەبێ بۆ قایماز مل بدا بەڵام زۆریش هەشیار بێ.

کاتێک کە حەلەب کەوتە ژێر سەروەریی موسڵ، قایماز لەتەک گۆڕینەوەی بەشەنگال وەکو پێشتر گوترا، کەوتە دەست تێوەردان. لەوانەیە وای بینیبێ کە مانەوەی حەلەب لەگەڵ موسڵ هێزی تێدا دەبێ بۆ عیزەددین مەسعوود کە ئەو نایەوێ لەبەرامبەر دەسەڵاتی خۆیدا بەهێزتر بێ، بۆیە لایەنی تەواوکردنی گۆڕینەوەکەی گرت کە پێشتر ئاماژەی پێدرا.

ئەگەر موجاهیدەددین نەیەوێ کەسایەتیەکی بەهێز لەئیمارەتی موسڵدا لەبەرامبەری هەبێ، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسایەتیە عیزەددین مەسعوودی میرەکەشی بێ، ئەوا رێی تێدەچێ کە کەسایەتیەکی وەکو موزەفەرەددین گۆگبورووشی نەوێ کە قایماز خۆی پێشتر لەئەربل دەری کردبوو. ئەوەش موزەفەرەددین خودی خۆیپێی زانیبوو. ئەمە وای لێکرد بەتوندی و چوست و چالاکی و هەشیاریەوە لەدژی قایماز و پڕۆژەکانی کار بکا.

هەلی دامەزراندنی لەلایەن عیزەددین مەسعوود وەکو والیەک لەسەر حەلەب و سەرۆکی دیوانەکەی لەساڵی ٥٧٧ک/١١٨١-١١٨٢ز(٣) قۆستەوەو دەستی کردە پتەوکردنی پێگەی خۆی لەوێ لەرێی دەست بەسەرداگرتنی قەڵاتی شارەکە، بەتایبەتیش کە عیزەددین مەسعوود زۆر لەوێ

نەمایەوە، بەڵکو بڕیاری گەڕانەوەی دا بۆ موسڵ و رادەستی سەرکردایەتیی سوپای کرد(٤).

پشت بەستنی عیزەددین بەموزەفەرەددین گۆکبورو لەحەلەب دەیسلمێنێ بۆمان کە موزەفەرەددین بووە یەکێک لەمیرە گەورەکانی سوپای زەنگی، بەلام موزەفەرەددین ئەو متمانەیەی قۆستەوە بۆ دەستکەوتنی شکۆمەندیی تایبەتی بۆ خۆی و هەوڵی دا بۆ دەست بەسەرداگرتنی شارەکە و سەپاندنی دەسەلاتی بەسەر هەمووواندا، هەتا دەبێتە هێزی یەکەم و دوای ئەوە هەلی بۆ دەڕەخسێ تۆڵەی خۆی لەموجاهیدەددین قایمازی دوژمنی کۆنی و سەرۆکە نوێیەکەی بکاتەوە.

کاتێک کە موزەفەرەددین دەبیستێ عیزەددین بەتەمایە لەژێر زۆری لێکردنی موجاهیدەددین قایمازدا حەلەب بەشەنگال بگۆڕێتەوە، ترسا کاروبارەکانی لەدەست دەربچن(٥) و هەلی خەونی تۆڵەکردنەوەی لەقایماز لەدەست بدا، بەتایبەتیش کە قایماز هەموو قورساییەکەی خۆی خستبووە سەر لایەنی تەواوکردنی ئەو گۆڕینەوەیە. لەوانەیە قایماز وای بینیبێ کە گۆکبورو دوور نیە ببێتە هێزێک لەحەلەب، بۆیە کاری لەسەر لاوازکردنی دەکرد لەڕێی جێبەجێ کردنی ئەو گۆڕینەوەیە هەتا لەو هەلە زێڕینە بێ بەشی بکا. ئەمە وای لێکرد کە هەوڵی کۆنترۆڵکردنی حەلەب بدا. یان لەبەر ئەوەی گۆکبورو پێی وابووە کە عیمادەددین

زەنگی پشتی تێدەکا، هەر کاتێک کە حەلەب وەردەگرێ، بۆیە هەوڵی تەواوی دا بۆ دەست بەسەرداگرتنی شارەکە بەشێوەیەک کە زۆر لەکودەتایەکی سەربازی دەچوو، ئەوەش پێش ئەوەی گۆڕینەوەکە مۆر بکرێ و ببێتە هۆی شڵەژانی هەردوو برایەکە، عیزەددین مەسعوودی خاوەنی موسڵ و عیمادەددین زەنگیی خاوەنی شەنگال(٦).

ئەوەی ئیبن (ئەبی تەی ئەلحەلەبی) لەم بارەیەوە دەڵێ وای دەگەیەنێ کە موزەفەرەددین گۆکبورو پێش ئەوەی دانووسانی گۆڕینەوە لەنێوان هەردوو برا، عیزەددین و عیمادەددین، دەست پێبکا و دوای رۆیشتنەوەی عیزەددین لەحەلەبەوە بۆ موسڵ، دەستی کردووە بەهەوڵدان بۆ دەست بەسەرداگرتنی حەلەب. ئیبن (ئەبی تەی) ئەوە بەهۆکارێک دادەنێ کە پاڵی بەو دوو برایەوە ناوە کە پەلە بکەن لەتەواوکردنی ئەو گۆڕینەوەیە(٧).

لەوانەیە موزەفەرەددین گۆکبورو وای بینیبێ کە قەڵاتەکە قایمترین شوێنە لەشارەکە و ئەگەر دەستی بەسەردا بگرێ، ئەوا پێگەکەی بەهێزتر دەبێ و لەلای گرنگ نابێ، ئەگەر عیزەددین مەسعوودی خاوەنی موسڵ و موجاهیدەددین قایمازی جێگری، شەڕ لەدژی رابگەیەنن، چونکە قەڵاتەکە لەدەستی خۆیدایە. لەبەر ئەوە موزەفەرەددین گۆکبورو پلانێکی دارشت بۆ دەست بەسەرداگرتنی قەڵاتەکە بەشێوەیەک کە تەنیا خۆی و

ژمارەیەکی کەم لەسەربازە دڵسۆزەکانی بچنە ناوێ بۆ ئەوەی گومان نەخاتە دڵی والیەکەی و ئەگەر توانی بەخۆی و سەربازەکانیەوە بچێتە ناویەوە، ئەوا کارەکەی بۆ ئاسان دەبێ و والیەکەی دەستگیر دەکا و دەیخاتە بەندیخانەوە. بەمەش سەربازگەکەی دەکەوێتە ژێر دەست و قەڵاتەکەش لەدەستی خۆیدا دەمێنێتەوەو پاش ئەوە هیچ هێزێک ناتوانێ دەری بکا، لەبەر بەرگریەکەی و بەهێزیی شووراکانی(٨).

بەڵام ئیبن نەدیم(٩) وێنای شکستی ئەو پلانەمان بۆ دەکا کە والی گومان لەڕێڕەوی موزەفەرەددین گۆکبورو دەکا و بۆ عیزەددین مەسعوود و موجاهیدەددین قایماز دەنووسێ و پێیان رادەگەیەنێ. لێرەدا گۆکبورو لەشکستهێنانی پلانەکەی دڵنیا دەبێ و خێرا ئەو تۆمەتە بەتەواوی لەسەر خۆی لادەدا، لەترسی تۆڵەکردنەوەی موجاهیدەددین قایماز، کە هەمیشە بۆی لەسەنگەردا بوو بۆ زیان پێگەیاندنی. بەوەش پاساوی کردەوەکەی دەداتەوە کە بۆ ئەوە پەنای بردووە بۆ قەڵاتەکە، هەتا خۆی لەحەشیشیەکان (کە گرووپێک بوون لەشیعەکان و ناویان بە «ئەلباتنیە» دەرکردبوو و کوشتنیان کردبووە گرنگترین چەکی دەستیان) بپارێزێ، ئەوانەی کە هۆشداریی کوشتنیان دابووێ.

هەرچیەک بگوترێ، ئەو کارە بووە هۆی تێکەوتنی درز لەپەیوەندیەکانی نێوان عیزەددین و موجاهیدەددین

قایماز لەلایەک و موزەفەرەددین گۆکبورو لەلایەکەی دیکەوە. هەرچەندە عیزەددین دەستی لەحەلەب هەڵگرتبوو بۆ عیمادەددین زەنگیی دووەمی برای و بەشەنگالی گۆڕیبۆوە، بەڵام دەبێ ئەوە بەڕوونی بزانرێ کە موزەفەرەددین گۆکبورو دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ دابڕاوەکەی لەحەڕڕان وەکو پاشکۆیەک بۆ دابڕاوەکانی موسڵ.

لەهەمان کاتیشدا دەبوایە لایەنی سەلاحەددینی ئەیووبی بگرێ لەململانێیەکانی لەگەڵ زەنگیەکان و ئیدی هیچ سوودێک نابینێ لەمانەوەی لەحەڕڕان لەژێر سەروەریی موسڵ و فەرمانڕەوایەتیی موجاهیدەددین قایماز(١٠).

زێدەڕۆیی ناکەین ئەگەر لێرەدا بڵێین کە موزەفەرەددین گۆکبورو پەرۆشی ئەوە نەبووە پشتگیریی سەلاحەددین لەشەڕەکانی لەگەڵ زەنگیەکاندا بکا لەبەر خۆشەویستیی بۆ سەلاحەددین، بەقەدەر ئەوەی پەرۆشی تۆڵەکردنەوە بووە لەموسڵ و قایمازی جێگرەکەی کە رێگای لەحەز و پلانەکانی گرتبوو.

بەم شێوەیە موزەفەرەددین گۆکبورو بەتەواوی لای سەلاحەددینی گرت و بەشداریی لەشەڕەکانی دژی زەگیەکان لەموسڵ و شوێنەکانی دیکەش کرد.

**پەراوێزەکانی(٤):**

١–ابن شداد: سيرة صلاح الدين ص٥٢

الحنبلي: (احمد بن ابراهيم) شفاء القلوب في مناقب ابن ايوب تحقيق ناظم رشيد وزارة الثقافة والفنون العراقية عام ١٩٧٨م ص٩١.

رشيد الجميلي: دولة الاتابكة في الموصل بعد عمادالدين ص١٢٥/١٢٦

.Sellon: Op. Cat. Vol. 1, P.568

٢–ابن الاثير: الكامل ج١١ حوادث ٥٧٦هـ

العيني: عقد الجمان مصدر سابق ج١٢ رقم ٦٠١ حوادث ٥٧٦هـ

٣–عبدالقادر طليمات: مظفرالدين كوكبوری ص٧٧

٤–ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٥ ص٢٠٤

ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١٠٩

٥–عبدالقادر طليمات: المرجع السابق

٦–عبدالقادر طليمات: المرجع السابق

٧–ابو شامة كتاب الروضتين ج٢ ص٣٠

٨–عبدالقادر طليمات: مظفرالدين كوكبوری ص٨١

٩–عبدالقادر طليمات: مظفرالدين كوكبوری ص٨٢ نقلا عن ابن العديم مخطوط ج٢ لوحة ٢٠٠ . ئەمە لەبەر ئەوەی من نەمتوانی دەستنووسەکە ببینم.

١٠–ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٥ ص٢٠٤–٢٠٥

ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١١٦.

## (٥)
## هەڵوێستی قایماز بەرامبەر هێرشی سەلاحەددین بۆ سەر موسڵ لەساڵەکانی ٥٧٨، ٥٨١ک – ١١٨٢-١١٨٣ز، ١١٨٥-١١٨٦ز:

لەرِقی قایماز، موزەفەرەددین دەستی کردە پەیوەندیکردن بەسەلاحەددین و هانی دەدا بەرەو موسڵ بێ و وا نیشانی دەدا کە شارەکە بێهێزە و پشێویی تێدایە و ئاسانە بۆ داگیرکردن. نامەیەکیشی بۆ سەلاحەددین نارد تێیدا پەلەی لێکرد بۆ ئەوەی لەفورات بپەرِێتەوەو لەهەمان کاتیشدا ئامادەییی تەواوی خۆی نیشاندابۆ پێشکەشکردنی هەرچیەکی لەدەستی بێ بۆ سەرخستنی. ئەوکات سەلاحەددین گەمارۆی شاری بەیرووتی خاچپەرستی دابوو لەساڵی ٥٧٨ک، ١١٨٢–١١٨٣ز. ئەمە وای لێکرد شارەکە بەجێ بێڵێ و بەخێرایی بەرەو جەزیرە پێشرەوی بکا بۆ ملکەچکردنی موسڵ(١).

سەلاحەددین بەخێرایی بەرەو فورات هات و لەناوچەی تورکمانان، لەنزیک حەلەب(٢)، لەگەڵ موزەفەرەددین گۆگبورو کۆبۆوە. دوای رێککەوتن لەسەر پلانێکی سەربازیی هاوبەش، سەلاحەددین رۆیی و لەفورات پەرِیوەو ژمارەیەک ناوچەی لەخاکی جەزیرەی فورات داگیر کرد.

ئەو جووڵەکردنانەی عیزەددین مەسعوود و موجاهیدەددین قایماز لەموسڵەوە بۆ دارا هیچ دادی نەدان،

هەرچەنـدە هەردووکیـان لـەو جووڵەکردنانـەدا دەیانویست کار لەجووڵەکردنەکانـی سـەلاحەددین بکـەن، بـەڵام هـەر زوو گەڕانـەوە بـۆ موسڵ لـەو کاتـەی کـە بەجووڵەکردنـی سـەلاحەددینیان زانـی کـە لەفـورات پەڕیوەتـەوە بـۆ خاکـی جەزیـرەی موسـڵ بـۆ ئـەوەی لەچاوتێبڕینەکانـی بیپارێـزن(٣).

ئەوجـا سـەلاحەددین توانـی رەهـا بگـرێ، هەرچەنـدە زۆر بەهێـز و پارێـزراو بـوو و بەسـەر هاوپەیمانەکـەی خـۆی، موزەفەرەددیـن گۆکبـوروی دابـڕی، سـەرباری ئـەو دابڕانانـەی کـە لەحەڕانـدا لەبـن دەسـتی دا بـوون(٤).

ئـەوەش واتـە لێـدان لەعیزەددیـن مەسـعوود و موجاهیدەددیـن قایمـاز و بەهێزکردنـی پێگـەی دوژمنەکەیـان گۆکبـورو. دوای ئـەوەش توانـی چەنـد ناوچەیەکـی دیکـەی سـەر بەموسـڵ بخاتـە ژێـر دەسـتی، بەمـەش لەناوچـە پارێزراوەکانـی رووت کـردەوەو دەسـتی بەسـەرداگرتنی ئاسـانتر کـرد لـە ١١ی رەجەبـی سـاڵی ٥٧٨ک/١٠ی تشـرینی دووەمـی سـاڵی ١١٨٢ز(٥).

سـەلاحەددین کۆبوونەوەیەکـی سـەربازیی گرێـدا بـۆ تاوتووکردنـی کاروبـاری موسـڵ و هەمـوو رایـەکان لـەدوو رای جیـاوازدا کـورت کرانـەوە کـە یەکێکیـان داوای هێرشکردنە سەر شـەنگالی دەکرد پێش موسڵ و رای دووەم داوای یەکسـەر هێرشـبردنە سـەر موسـڵی دەکـرد چونکـە ئەگـەر موسـڵ بکـەوێ ئـەوا شـەنگال و هیدیکـەش هـەر

لەخۆیانەوە لەژێر لێدانەکانی سوپای شەڕکەر دەکەون.

لێرەوە دوژمنکاریی موزەفەرەددین گۆکبورو و لایەنگرەکانی بەئاشکرا بۆ موسڵ دەرکەوت، کاتێک کە لەگەڵ ئەو رایەدا بوو کە یەکەمجار هێرش بکەنە سەر موسڵ. ئەمەش وای لەسەلاحەددین کرد بەرەو ئەو بیرۆکەیە بچێ و گەمارۆی سەر موسڵ جێبەجێ بکا(٦). مێژوونووس ئیبن ئەسیر ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە ناسرەددین محەمەدیش چووە بەرەی گۆکبورو و پارەیەکی زۆری دایە سەلاحەددین، وەکو پابەندبوونێکی کەسیی، بۆ ئەوەی دوای داگیرکردنی، موسڵی بەسەردا ببڕێ، بۆیە لەکاتی گەمارۆدانی شارەکە شێلگیرانە شەڕی دەکرد(٧).

عیزەددین مەسعوود پەیمانی دایە موجاهیدەددین قایماز بۆ ئەوەی سەرپەرشتیی تەواوی ئەو ئامادەکاریانە بکا کە بۆ بەرگریکردن لەموسڵ دەکران لەبەرامبەر گەمارۆدانی سەلاحەددین ئەیووبیدا. قایمازیش چەند رێکارێکی گرتنەبەر بۆ ئەوەی ئەو بەرگریانە بەهێز بن و ورەی سەربازەکانی بەرز بکەنەوە، بۆیە پارەیەکی زۆری دەرهێنا و بەسەریاندا دابەشی کرد بۆ هاندانیان لەسەر شەڕێکی دەستەویەخە لەپێناو موسڵ. کەلوپەلی شەڕکردنی بۆ کاتی گەمارۆدان هێنا و چەکی جۆراوجۆری خستە بەردەست. هەروەها کاری لەسەر دابینکردنی خۆراکی پێویست کرد بۆ ئەوەی نرخیان

بەرز نەبێتەوەو تووشی پەشۆکاوی نەبن، ئەوانە وەکو ئامادەکاریەک بۆ گەمارۆدانێکی ماوە درێژ.

بەگشتی، قایماز ئەوەی لەدەستی هات کردی لەپێناو مانەوەی بەرەی موسڵ بەتوندی و یەکگرتوویی، بەرامبەر گەمارۆی سەلاحەددین و بۆ ئەوەیش کە دانیشتووانەکەی بە لەگەڵیەکتر گونجاو بمێننەوە. ئەمە بووە هۆی هێوربوونەوەی خەڵک و ئارامبوونی دەروونیان و شارەکەش بووە قەڵاتێکی سەربەرز لەبەرامبەر گەمارۆدا. لەهەمان کاتدا قایماز ئەوەشی لەبیر نەکرد کە شارەکانی دیکەی سەر بەموسڵ پڕ بکا لەجەنگاوەر و کەلوپەلەکانیان و ناردنی ئازووقە و کەلوپەلی پێویست وەکو جەزیرەی ئیبن عومەر و شەنگال و ئەربل و هیدیکەش(٨).

وە بۆ ئەوەی قایماز پلانە سەربازیەکەی توندتر بکا، فەرمانی بەسەربازەکانی کرد کە نەچنە دەرێ بۆ بەگژداچوونی هێزەکانی سەلاحەددین لەدەرەوەی شوورایەکە، بەڵکو پێویستە لەسەریان لەپشت شووراکانەوە بەبەردەوامی شەڕتەقەیان لەگەڵدا بکەن و تەنیا ئەگەر پێویستی کرد بچنە دەرەوە، وەکو ئەوەی کە کاتێک روویدا کە سەلاحەددین ئاگرهاوێژەکانی دامەزراندبوو و ئاگری پێیان لەشارەکە دەگرت و پیاوەکانی موسڵ ناچاربوون لەسەر شێوەی هێزێکی گیانفیدا بچنە دەرەوە و ئاگرهاوێژی سەلاحەددین لەناو ببەن و پارچەکانی دەست بەسەردا بگرن و بگەڕێنەوە

بۆ سەنگەرەکانی خۆیان.

هەروەها لەناوەوەی شووراکانیشدا ئاگرهاوێژ دامەزرێنن کە هێزەکانی سەلاحەددینیان ئاگرباران دەکرد کە لەدەرەوەی شووراکاندا بوون. پاشان قایماز هەموو رێبازەکانی شەڕکردنی بەردەست و گونجاوی پەیڕەوکردن، لەوانە رێبازێکی بەکارهێنا کە بریتی بوو لەوەی وای لەدوژمن گەیاند کە هێرشێکی لەناکاوی دەکاتە سەر، بەوەی کە فەرمانی بەکۆمەڵێک لەسەربازەکانی کردبوو لەوانەی کە چرای ئاگری گۆگردیان هەڵدەگرت کە لەدەرگای (ئەلسەر)ی‌قەڵاتەکەبچنەدەرێ بۆ سەر رووباری دیجلەی نزیکیان و ئاگرەکان گەش بکەنەوە، پاشان لەناو رووبارەکەدا بیکوژێننەوە. ئەمە لەئەنجامدا سەلاحەددینی ترساند و ناچاری کرد کە لەدووری شووراکانی شارەکە شەو بکاتەوە لەترسی هێرشێکی لەناکاودا(٩).

هەموو ئەو رێکارانە و هیدیکەش یارمەتیدەربوون بۆ شکست پێهێنانی گەمارۆی یەکەمی سەر موسڵ و سەلاحەددین ناچار بوو موسڵ بەجێ بێڵێ و لە ٦ی شەعبانی ساڵی ٥٧٨ک/١٥ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١١٨٢ز(١٠) و بڕوا بۆ شەنگال. بەم شێوەیە پلانە بەرگریکارەکانی قایماز سەرکەوتن و گەمارۆیەکە شکستی هێنا، هەرچەندە موسڵ زۆر لەناوچەکانی سەر بەشارەکەی لەدەستدا، بەڵام ئەو شکستەی سەلاحەددین لەموسڵ بووە سەرکەوتن لەشەنگال و توانی کۆنترۆڵی

شارەکە بکا. هەرچەندە موسڵ شەنگالی لەدەستچوو، ئەو شوێنە ستراتیجیە گرنگەی، بەڵام بەدەست بەستراوی نەمایەوە لەبەرامبەر ئەو رووداوە، بەڵکو دەستی کردە پەیوەندیکردن بەمیرەکانی ناوچەکە بەو هیوایەی یارمەتیەکی پشتیووانیکردنی لێیانەوە دەستکەوێ بۆ ئەوەی بتوانێ لەبەرامبەر چاوتێبڕینەکانی سەلاحەددینی ئەیووبیدا بووەستێتەوە.

ئەوەی گرنگ بوو، ئەو پەیوەندیانە بوون کە لەئەنجامدا هاوپەیمانیەتێکی لێکەوتەوە لەنێوان و ماردین و بەدلیس و ئارزن، لەوکاتەی کە سەلاحەددین شەنگالی داگیرکردبوو(١١). بەڵام ئەو گردبوونەوەیەش دژی سەلاحەددین نەیتوانی شتێک بکا شایانی باسکردن بێ، لەکاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سەلاحەددینی ئەیووبی، نەیتووانی لەنزیک گوندی (حەرزم)، چونکە گردبووەوەکان یەکسەر دوای ئەوەی هێزی سەلاحەددین و توانای تەواوی شەرکردنیان بینی، بڵاوەیان لێکرد.

لێرەدا سەلاحەددین بەسەر هێزەکانی عیزەددین مەسعوود و موجاهیدەددین قایمازی هاوپەیمانی لەموسڵ سەرکەوت. ئەوەش لەئەنجامدا بووە هۆی داگیرکردنی ناوچەی دیکەی تازە لەموڵکەکانی موسڵ(١٢).

ئەو لێدانەی کە بەتوندی بەر موسڵ کەوت، بریتی بوو لەداگیرکردنی سەلاحەددین بۆ حەلەب لەساڵی ٥٧٩ک/١١٨٣ز، ئەوە واتای شکست هێنانی

پلانە سەربازیەکانی موجاهیدەددین قایماز بوو(١٣). موجاهیدەددین قایماز لەکۆتاییەکانی ئەو ساڵەدا، ٥٧٩ک، تووشی گرتن و بەندیکردن بوو و هەتا سەرەتاکانی ساڵی ٥٨٠ک/نیسانی ١١٨٤ز، کە بەردرا بۆ ئەوەی دەست بەئەرکی بەرگریکردن لەموسڵ بکاتەوە لەبەرامبەر گەمارۆی دووەمی سەلاحەددینی ئەیووبی دا(١٤).

ئەوەی کە گرنگە، قایماز لەبەندیخانە دەرچوو و گەڕایەوە بۆ دەستکردن بەئەرکەکانی و دەسەڵاتەکانی خۆی بەتەواوی، وەکو ئەوەی پێش گرتنی هەیبوو، بەدەست هێنایەوە، بەڵام خودی خۆی دڵنیا نەبوو لەمیرەکانی زەنگی، ئەوانەی کە چاکەیان بەسەریەوە هەبوو و دۆخەکەش وەکو پێشوو نەمابوو و گۆڕابوو، چونکە ئەربل و جەزیرەی ئیبن عومەر چووبوونە پاڵ ڕیزەکانی سەلاحەددین(١٥). ئەوەش شڵەژانی هەڵوێستی موجاهیدەددین قایماز و موسڵی پتر کردبوو.

کێشەی ئەربل و جەزیرەی ئیبن عومەر ببووە ئەو تاشەبەردەی کە دانووسانەکانی نێوان سەلاحەددین و موسڵی لەسەر وردوخاش بوو، ئەوەی کە پەیوەست بوو بەئاشتەوایی بەردەوام لەنێوانیاندا و کۆتایی هێنان بەناکۆکیەکان و ئەرکە هاوبەشەکان لەبەرامبەر دوژمنەکانی ناوچەکە ڕێک بخا(١٦).

لەڕاستیدا گرتنی قایماز و بەندکردنی، هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ شێواندنی بەرەی ناوخۆ لەموسڵ و

لەهەمان کاتیشدا سەلاحەددین چاوی بڕیبوویێو دەستی کردبوو بەهێرش کردنە سەر موسڵ و سەرلەنوێ گەمارۆدانیەوە(١٧). ئەوەش پاڵی بەعیزەددینی میری شارەکەوە نا بۆ ئەوەی لەقایماز خۆشبێ و بەری بدا، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بۆ سەلاحەددینی ئەیووبی بێتەوە مەیدان. ئەو گرتنە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی بەرچاوڕوونی و کەمتەرخەمی لەکاروباری سیاسیدا، لەلایەن عیزەددین مەسعوود و ئەگەر دەستوەردانی (پەهلەوان) خاوەنی هەمەدان و ئەلجەبەل نەبووایە، کە زۆری لەلا سەخت بوو موسڵ بەو لاوازیە ببینێ لەبەرامبەر سەلاحەددیندا، بۆیە هەوڵی دا بۆ بەردانی قایماز لەلایەن عیزەددین مەسعوود و ئەویش لەبەر بەرژەوەندی قایل بوو، دەنا قایماز هەتا ماوەیەکی درێژ هەر بەدەست بەسەریەوە دەمایەوە.

گرنگ ئەوەیە کە موجاهیدەددین قایماز هەرکە لەبەندیخانە دەرچوو، هاتەوە سەر کارەکانی پێشووی، ئەوەش بەڵگەیە کە موسڵ پێویستیی بەخزمەت و ئەرکەکانی هەبووە. ئیدی دەستی کردەوە بە داڕشتنی پلانەکانی سەرلەنوێ بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشبەران و وەستان لەبەرامبەر سەلاحەددین، بۆ ئەوەی ناچاری بکا واز لە بیرکردنەوە لەگەمارۆدان و سەرلەنوێ هێرشکردنە سەر موسڵ بێنێ.

**پەراوێزەکانی(٥):**

١–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٨٢–٤٨٣ حوادث ٥٧٨هـ

ابو شامة: كتاب الروضتين ج٢ ص٣٠ نقلا عن الاصفهاني

Sellon. Op. cat.Vol.1 P. 576

٢–ابو شامة: كتاب الروضتين ج٢ ص٣٠ عن ابن ابي علي

ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١١٦

٣–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٨٣ حوادث ٥٧٨هـ

٤–ابو شامة: كتاب الروضتين ج٢ ص٣٢

=ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٨٣–٤٨٤ دەڵێ: داگیرکردن لە جەمادی یەکەم ٥٧٨ک.

ابن شداد: الاعلاق الخطيرة ج٣ ق١ ص٩٦–٩٧

٥–ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٥ ص٢٠٥.

اصطفان الدويهي: تاريخ الازمنة ميكروفيلم جامعة الكويت رقم ٢٥٤ ورقة ٩٩ب دەڵێ: سەلاحەددین گەمارۆی موسڵی بۆ یەکەم جار لە ساڵی ٥٧٧ک/١١٨١ز دا و ئەوەش هەڵەیە.

ابو الفضايل الحموي: التاريخ المنصوري ص١٨٧

٦–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٨٤–٤٨٦

ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١١٨

٧–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٨٤–٤٨٦

ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١١٩

٨–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٨٥ مصدر سابق

ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١١٩

العيني: عقد الجمان ميكروفيلم جامعة الكويت ج١٢ رقم٦٠١ حوادث ٥٨٧هـ

٩–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٨٦

ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١٢١–١٢٢

١٠–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٨٦

ابن العبري: تاريخ مختصر الدول ص٢١٨–٢١٩

ابو الفداء: المختصر ج٣ ص٦٥

ابن العماد الحنبلي: ضذرات الذهب ج٤ ص٢٥٩

١١–ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٤٨٩

ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١٣٣

١٢–ابن شداد: سيرة صلاح الدين ص٥٨ تحقيق جمال الشيال

الايوبي: مضمار الحقائق ص١١٣–١١٤

Sellon, Op. Cit. Vol. 1 P. 577
S. L. Poole Saladin P. 171-172
١٣-ابو الفداء: المختصر ج٣ ص٦٦
ابن الوردي: تتمة المختصر ج٢ ص١٣٣
Selton. Op. Cit. Vol. 1 P. 578
١٤-شوێنێکی تایبەتی بۆ گرتنی موجاهیدەددین قایماز تەرخان دەکەین دوای تەواوبوونی هەڵوێستەکەی لەپێش هێرشەکانی سەلاحەددینی ئەیووبی بۆ سەر موسڵ و موڵکەکانی لەناوچەکەدا.
١٥-ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١٥٦
العيني: عقد الجمان ميكروفيلم جامعة الكويت رقم ٦٠٢ حوادث ٥٧٩هـ
١٦-ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٥٠٠-٥٠٢ ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١٥٦
سبط الجوزي: مراة الزمان ج٨ ق١ ص٣٧٨
١٧-العيني: عقد الجمان ج١٣ ميكروفيلم جامعة الكويت رقم ٦٠٢ حوادث ٥٧٩هـ

## (٦)
## پلانی قایماز دژی سەلاحەددین و چاوتێبڕینەکانی لەجەزیرە و موسڵ ساڵی ٥٨٠ک/١١٨٤-١١٨٥ز:

قایماز دەستی کردەوە بەپلاندانان بۆ راگرتنی گەمارۆی سەرلەنوێی سەر موسڵ لەلایەن سەلاحەددین کە هەموو ئەرکەکانی تەرخان کردبوو بۆ خستنی ئیمارەتی موسڵ و لکاندنی بەسەروەیەکانی خۆیەوە بەهەر رێگایەک بێ. قایمازیش دەستی کردبووەوە گەڕان بەدوای هاوپەیمانیی نوێ بۆ موسڵ و بەخۆی چووە لای شەمسەددین پەهلەوانی خاوەنی ئەلجەبەل و هەمەدان، ئەوەی کە لەکاتی بەندکردنەکەی نێوەندگیریی کردبوو بۆ بەردانی. هەروەها چووە لای قزڵ ئەرسەلانی برای و داوای لێکرد بەهانایەوە بچن و یارمەتیی بدەن.

یەکەمجار پەیوەندیی بەقزڵ ئەرسەلانی خاوەنی ئازەربایجان کرد، ئەویش بەگەرمی پێشوازیی لێکرد و ویست و ئارەزووێکی زۆری نیشاندا بۆ رێگریکردن لەسەلاحەددینی ئەیووبی، بەجۆرێک کە پەیمانی دابووێ هەر یارمەتیەکی کە لەدەستی بێ پێشکەشی بکا و پەیمانی دا هەواڵەکە بگەیەنێتە پەهلەوانی برای و هاوکاریی بکا لەم بارەیەوەو رایگەیاندبوو کە پێویست ناکا قایماز بەخۆی پەیوەندیی پێوە بکا، چونکە هەر خودی خۆی بۆ ئەم کارە بەسە. یەکسەر سێ هەزار

جەنگاوەریشی ئامادەکرد و لەگەڵ قایمازی ناردن بۆ سەرکوتکردنی ئەربل کە لایەنگریی سەلاحەددینی کردبوو لەململانێیەکانی لەگەڵ موسڵ و بەقایمازی گوتبوو: «ئەوەی تۆ هەڵیدەبژێری من دەیکەم»(١).

سەربازە نوێیەکانی قایماز پەیڕەویی رێچکەی شەڕی ئابووریان کرد لەهێرشەکەیان بۆ سەر ئەربل، بۆ ئەوەی ناچاری بکەن سەرلەنوێ ملکەچ بکاتەوە بۆ موسڵ و کێڵگە کشتوکاڵیەکانیان تێکدا وماڵەکانیان تالان کرد و ژنیان بەدیل گرتن و ئەوپەڕی توندوتیژیان لەدژی دانیشتووان پەیڕەو کرد. لەگەڵ ئەوانەشدا زەینەددین یوسفی میرەکەی ئازایەتیەکی ناوازەی نواند و توانی ئەو هێرشە دڕندانەیە رابگرێ و نەیەڵێ سەرکەوتن بەدەست بێنن(٢).

هەروەها سەربازانی قایماز و قزڵ لەکاتی هێرشکردنە سەر ئەربل رێچکەی تێکدان و کاولکردنیان پەیڕەو کرد و چەند کردەوەیەکیان ئەنجامدا کە هیچ شایانی ژن و منداڵ و پیرەکان نەبوو. قایماز لەو کردەوانە پەشیمان بوو و زۆرجاران سەرکۆنەی ناخی خۆی دەکرد و دەیگۆت: لە تۆڵەی ئەوەی عەجەمەکان بەئەربلیان کرد، خودا سزام دەدا(٣).

پەلامارادانی ئەربل کە یەکێک بوو لەئەندامەکانی بەرەی شەڕکەری سەلاحەددین، بووە هۆی جووڵاندنی زگرەشیە شاراوەکانی سەلاحەددینی ئەیووبی کە ئەوکات بارودۆخ

ڕێگـەی دەدا بـەرەو موسـڵ پێشـڕەوی بـکا و هێـرش بکاتـە سـەری، بەتایبەتـی کاتێکیـش نامەبەرانـی ئەربلـی لـە١٩ی جەمـادی ئاخیـرەی سـاڵی ٥٨٠ک/٢٧ی ئەیلوولـی سـاڵی ١١٨٤ز(٤). پێگەیشـتن کـە مـوژدەی سـەرکەوتنیان بەسـەر قایمـاز و هاوپەیمانەکانـی پێبـوو، هەنـدەی دیکـە کەوڵـی پڕبـا بـوو(٥).

بارودۆخەکـە لەسـاڵی ٥٨٠ک/١١٨٤-١١٨٥ز، ئـەوەی کـە پەیوەندیـی هەبوو بەململانێی نێوان موسڵ و سەلاحەددین، بەدڵـی سـەلاحەددین بـوو، چونکـە تووانـی لـەو سـاڵەدا ڕێککەوتنێـک لەگـەڵ میـری تەڕابوڵسـی(٦) خاچپەرسـت گرێ بدا بۆ ئـەوەی دەستی بەتـاڵ بێ بۆ موسڵ. پاشـان نامەبەرانـی خەلافەتـی عەباسـی گەیشـتبوونە دیمەشـق بـۆ ناوەندگیـری کـردن لـەو ململانێیـە و ناکۆکیـەکان نەیەڵـن و ئەرکـەکان ڕێـک بخـەن، بـەڵام ئـەو دانووسـانانە نەبـووە هـۆی ئاشـتەواییەکی خـوازراو بەهـۆی نەخۆشـکەوتنی ئـەو دوو نامەهەڵگـرەی کـە لەبەغـدادەوە نێردرابـوون و تەنانـەت مردنیشـیان لەڕێگـەی گەڕانەوەیـان، دوای نەخۆشکەوتنیان، پێـش ئـەوەی بگەنـەوە (ئەلرەحبـە)(٧) لەڕێگەیانـدا بـەرەو بەغـداد.

بـەڵام هەرچۆنێـک بـێ سـەلاحەددین لەسـەرەتای سـاڵی ٥٨١ک/٤ی نیسـانی ١١٨٤ز(٨) بـەرەو موسـڵ ڕۆیـی و تووانـی بەخـۆی و کۆمەڵێک لەفـورات بپەڕنـەوەو کۆنتڕۆڵـی چەنـد ناوچەیەکـی کـرد و بـەرەو موسـڵ پێشـڕەویان کـرد و

لەئیسماعیلیات لەنزیک شارەکە لە ١١ی رەبیعولئەوەلی ٥٨١ک/١٢ی حوزەیرانی ١١٨٥ز(٩) دابەزیّ و لەویش هێزەکانی ئەربلی گەیشتنیّ و ئەویش لەلای خۆیەوە نامەهەڵگرانی ناردە بەغداد بۆ ئەوەی بەخەلیفەی عەباسی رابگەیەنیّ کە بەتەمای کۆنترۆڵکردنی موسڵە(١٠).

بەڵام قایمازیش بەدەست بەستراوی نەوەستا، بەڵکو سەربازەکانی ریکخستنەوەو پارەو چەکی دانیّ و خواردن و ئازووقەی بۆ دابین کردن، وەکو ئامادەکاریەک بۆ گەمارۆیەکی درێژخایەن. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی گەمارۆیەکەی سەلاحەددین هیچ سوودێکی نەبیّ. پیاوەکانی موسڵ بەرگریەکی گەورەیان نیشاندا لەبەرامبەر سەلاحەددین تا ئەو ئاستەی کە بیری لەوە کردەوە ئاو لەسەر شارەکە ببڕیّ بۆ ناچارکردنی دانیشتووانەکەی بۆ ملکەچکردنیان بۆی. سەرچاوەکان جەختیان کردۆتەوە لەسەر ئەوەی کە بەڕاستی سەلاحەددین بیری لەتێنوو و برسیکردنی خەڵکی شارەکە کردۆتەوەو ئەندازیارانیشی هێناون، لەوانە فەخرەددین ئەبو شوجاعی بەغدادی، بۆ لێکۆڵینەوە لەئەگەری لادانی ڕێڕەوی رووباری دیجلە. ئەو ئەندازیارانەش پێیان نیشانداوە کە لادانەکە دەکریّ، بەڵام ئەوەی ریگرە زۆریی تێچوون و درێژیی ئەو ماوەیەی کە پێویستە بۆ ئەو لادانە(١١).

لەکۆتایی رەبیعولئاخری ساڵی ٥٨٠ک/٣٠ تەمووزی ١١٨٥ز، لەبەر پەرەسەندنی رووداوەکان لەناوچەکانی

دیکەی خاکی جەزیرەی فوراتی، سەلاحەددین موسڵی بەجێهێشت، چونکە ناکۆکی لەسەر فەرمانڕەوایی (خەلات) کە یەکێک لەشارەکانی جەزیرە بوو لەدیاربەکر، بووە هۆی بانگهێشتکردنی بۆ ئەوەی لەوێ ئامادە بێ، بۆیە بەخێرایی رۆیشت(١٢) و لەو ناوچەیەدا ژمارەیەک کردەی سەرکەوتووانەی ئەنجامدا، بەڵام هێشتا لەئاست حەزوئارەزووە کەسیەکانی سەلاحەددین نەبوو، بۆیە بڕیاری دا بۆ جاری سێیەم بگەڕێتەوە سەر گەمارۆدانی موسڵ، بەڵام هەوڵەکانی سەلاحەددین و هاوپەیمانەکانی ئەوجارەش شکستیان هێنا و نەیتووانی بچێتە ناو شارەکە و ناچار بوو گەمارۆیەکەی هەڵگرێ و بەنەخۆشیەوە شارەکە بەجێ بێلێ. بەڵام رووداوەکان پەرەیان سەند و لەموسڵ بەرەو ئاراستەیەکی دیکە چوون، چونکە پیاوەکانی هەوڵی ئاشتبوونەوەیان دا لەسەر ئەو باوەڕەی کە ناکۆکی و پەرتبوون رێگەی سەرکەوتن بۆ دوژمن خۆش دەکا، بۆیە دەبێ لەگەڵ سەلاحەددین پەیمان ببەستن کە نوێنەرایەتیی حەزوئارەزووەکانی موسڵمانان دەکا لەبەرەنگاربوونەوەی دوژمنکارانی خاچپەرست. ئەو هەوڵەیان بەرهەمدار بوو و لەئەنجامدا رێککەوتنی ئاشتیی (حەڕان) لەنێوان هەردوو لایەن لە ٩ی زیلحیججەی ساڵی ٥٨١ک/٢ی ماری ١١٨٩ز مۆرکرا(١٣).

لەسەرووی ئەوانەی هەوڵی رێککەوتنیان دەدا لەموسڵ،

موجاهیدەددین قایماز بوو، کە دیارە لەوە دڵنیا بووە کە سەلاحەددین هەر دەبێ لەو ململانێیەی لەگەڵ موسڵ سەرکەوێ، بەتایبەتیش کە ئەو بەجێبەجێکاری داوا بەپەرۆشەکانی موسڵمانان دەزانێ لەدامەزراندنی یەکێتیەکی ئیسلامی بۆ شەڕکردن لەگەڵ خاچپەرستەکان و ئەوەی ئەورۆ لەسەر خۆی و موسڵ پێویستە ئەوەیە کە دەبێ بچێتە ناو ریزەکانی سەلاحەددین بۆ ئەوەی لەو رەوتە ئیسلامیە دانەبڕێ. هەر ئەوەش ئەو گۆڕانەمان بۆ لێک دەداتەوە کە لەپێشان پتر بەسەر هەڵوێستی موسڵ داهات.

بەم شێوەیە قایماز بەردەوام بوو لەسەر جێبەجێکردنی ئەرکەکانی و بەڕێوەبردنی رووداوەکان لەموسڵ، هەتا چووە ژێر سایەی سەلاحەددینی ئەیوبی ولەژێر ئالای شەکاوەی ئەودا کەوتە بەرگریکردن لەدژی دوژمنی خاچپەرست.

دوای ئەوە موجاهیدەددین رووی کردە کاری ئاوەدانکردنەوەو چاکسازیی کۆمەڵایەتی و خێرکردن، لەوانە زۆر پرۆژەی ئاوەدانکردنەوەی لەموسڵ چێکرد.

سەرباری ئەوانە، کەوتە دەستوەردانی رووداوەکانی ناوچەکە و کاتێک کە پشێویەک لەناو کورد و تورکمانەکان لەساڵی ٥٨١ک/١١٨٥-١١٨٦ز روویدا(١٤) نێوەندگیریی کرد و ئاشتی کردنەوە.

**پەراوێزەکانی(٦):**

١-ابن الاثیر: الکامل ج١١ ص٥٠٤

٢-الذهبي: تاریخ الاسلام مخطوط میکروفیلم جامعة الکویت رقم ١٢٦٨ ورقة ١١٥٥ حوادث ٥٨٠هـ

٣-ابن الاثیر: الکامل ج١١ ص٥٠٤

٤-الذهبي: تاریخ الاسلام مخطوط میکروفیلم جامعة الکویت رقم ١٢٦٨ ورقة ١١٥٥

٥٨٠ .P ١ .SeTion. Op. Let. Vol

٥-ابن شداد: سیرة صلاح الدین ص٦٧

ابن واصل: مفرج الکروب ج٢ ص١٦٤

ابن کثیر: ج١٢ ص٣١٥ البدایة والنهایة ئیبن کەسیر دەڵێ: پەیامبەرانی خاوەنی ئەربل (زەینەددین یوسف) لەکۆتاییەکانی ساڵی ٥٨٠ک گەیشتنە دیمەشق و هانایان بۆ سەلاحەددین برد بەڵام ئیبن شەداد دەڵێ: ئەوانە لە ١٩ی جەمادی دووەم گەیشتن. ئەوەشیان پتر جێی باوەڕە چونکە لەسەردەمی ڕووداوەکان ژیاوەو هیچ بەرژەوەندیەکی لەساختەکردنیدا نەبووە چونکە خەڵکی موسڵ بووەو هەر خزمەتی موسڵی کردووە. دەبوایە پتر لایەنگریی موسڵی کردبایە لەنووسینەکانیدا بەڵام نەیکرد و لایەنگری هیچ یەکێک لەو تیپە نەبوو و هەموو بەدەستپاکی دادەنێن.

S. L. Poole: Saladin P. 192

6- Jonathan R. Smith: The Knight of the S. Jhon P. 85

Sellon: op. cit. vol. 1 p. 582

S. L. poole: Saladin P. 191

ئەگەری ئەوەش زۆرە کە سەلاحەددین ئاگربەس لەگەڵ میری تەرابولسی خاچپەرست گرێ بدا بۆ ئەوەی دەستی بەتاڵ بێ بۆ ئامانجی یەکەمی کە ملکەچکردنی ناوچەکەیە و دامەزراندنی یەکێتیەک و پاش ئەوە خۆی تەرخان بکا بۆ شەڕکردنێکی یەکجاری لەگەڵ خاچپەرستەکان.

٧-الایوبی: مجمار الحقائق ص٢٠٠

ابن الاپیر: الکامل ج١١ ص٥٩

٨-ابو شامە: کتاب الروچتین ج٢ ص٦١

ابن واصل: مفرج الکروب ج٢ ص١٦٥

٩-الایوبی: مجمار الحقائق ص٢١٤

المقريزي: السلوك ج١ ق١ گ١ ص٨٩
S. L. Poole: Saladin P. 172
١٠-العيني: عقد الجمان ميكروفيلم جامعة الكويت ج١٣ رقم ٦٠٢ حوادث ٥٨١
١١-ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٥١٣
ابن العبري: تاريخ مختصر الدول ص٢٢٠
ابن واصل: مفرج الكروب ج٢ ص١٦٧
الحنبلي: شفاء القلوب ص١١٤ كە تێیدا وەسفی خەڵكی موسڵ دەكا و دەڵێ: خەڵكەكەی (موسڵ ) هەموویان بۆ (سەلاحەددین) هاتنە دەرێ بەڕووتی و خۆیان نیشاندا بەڵام ئەم رووتانە بەگەری سەلاحەددینیان گرت.
١٢-شاهنشاه بن ايوب: منتخبات من تاريخ صاحب حماة ص٢٨٦
سبط الجوزي: مراة الزمان ج٨ق١ ص٣٨٣
ابن واضل: مفرج الكروب ج٢ ص١٦٨
الذهبي: تاريخ الاسلام مخطوط جامعة الكويت رقم ١٢٦٨ ورقة ١٥٥ ب حوادث٥٨١ هـ
١٣-ابن شداد: سيرة صلاح الدين ص٧٠
الحموي (ابو الفضايل): التاريخ المنصوري ص١٨٩ ويقول: تم الصلح عام ٥٨٢هـ والاصح اواخر عام ٥٨١هـ في ٩ ذي الحجة.
١٤-ابن الاثير: الكامل ج١١ ص٥١٩

## (٧)

## قایماز و نورەددین شای خاوەنی موسڵ ٥٨٩ک – ٦٠٧ک/١١٩٣ – ١٢١٠ز/١٢١١ز:

موجاهیدەددیـــن قایمـــاز دوای دەرچوونـــی لەبەندیخانـــە لەســـاڵی ٥٨٠ک/١١٨٤–١١٨٥ز بـــەردەوام خـەریکـــی خزمەتکردنـــی موســـڵ بـــوو لەســـەردەمی عیزەددیـــن مەســـعوودی خاوەنەکـــەی، هەتـــا ٢٧ی ســـەفەری ســـاڵی ٥٨٩ک/٤ی مارتـــی ١١٩٣ز، لەوکاتـــەی کـــە ســـەلاحەددینی ئەیووبـــی لەدیمەشـــق کۆچـــی دوایـــی کـــرد، ئەوجـــا قایمـــاز چـــاوی لەوەبـــوو کـــە موســـڵ ســـەرکردایەتیکردنەکەی جارانـــی بـــۆ بگەڕێتـــەوە، پـــاش ئـــەوەی ســـەرلەنوێ کەوتبـــۆوە دەســـت ســـەلاحەددین. ئـــەوکات دوو ئاڕاســـتە لەپێـــش موســـڵدا هەبـــوو کـــە دەبـــوو رووەو یەکێکیـــان بچـــێ، ئەوانیـــش، یەکـــەم: موســـڵ بەخێرایـــی دەســـت بەداگیرکردنـــی وڵاتانـــی جەزیـــرە بـــکا، ئەوانـــەی کـــە لەژێـــر فەرمانـــی دەرچووبـــوون. ئـــەوەش کۆمەڵێـــک لەپیاوماقووڵانـــی موســـڵ پشـــتگیریان دەکـــرد لەســـەرووی هەمووشـــیانەوە مەجدەددیـــن بـــن ئەســـیری(١) بـــرای عیزەددیـــن بـــن ئەســـیری خاوەنـــی (الکامـــل فـــی التاریـــخ). لەکاتێکـــدا ئاڕاســـتەی دووەم بـــەرەو ئـــەوە بـــوو کـــە چـــاوەڕێ بکـــەن و موســـڵ دەســـت بکاتـــە نامەنـــاردن بـــۆ ئـــەو لایەنانـــەی ســـەربەخۆی بـــوون و ئەوانەشـــی کـــە دراوســـێی خاکەکـــەی بـــوون، بـــۆ ئـــەوەی پێکـــەوە کار بکـــەن بـــۆ گەڕاندنـــەوەی موڵکەکانـــی موســـڵ لەناوچەکـــەدا. ئـــەو

ئاڕاستەیەش لەلایەن موجاهیدەددین قایمازەوە لایەنگری دەکرا(٢).

مەجدەددین بن ئەسیر بەتوندی بەرگریی لەتێڕوانینەکەی دەکرد و روونی کردبۆوە کە ئەو میرانەی مەبەستیەتی، ئەوانەن: موزەفەرەددین گۆگبورو، عیمادەددینی خاوەنی شەنگال و موعەزەددین سنجەرشای خاوەنی جەزیرەی ئیبن عومەر. ئەوانە خێریان بۆ موسڵ و خودی موجاهیدەددین قایماز نەدەویست و نەیاندەتوانی بچنە ناو هێزە جەنگاوەرەکەی موسڵ و کارکردن بەرێکوپێکی لەگەڵیدا. پاشان عیزەددینی خاوەنی موسڵ ئەگەر بەخێرایی بەسوپاکەیەوە رووەو ناوچەکانی جەزیرە بڕوا و بۆیان بنووسێ کە پێویستە ملکەچی بن، لەوانەیە لەترسی هێزەکەی بەقسەی بکەن، بەڵام ئەگەر چاوەڕێی رێککەوتنی پێشینە بکەن و پاشان چاوەڕێی هاتنیان بکەنبۆی، ئەوە رایەکی راست نیە. ئەوە بووە هۆی تووڕەبوونی موجاهیدەددین قایماز، بۆیە مەجدەددین ئیبن ئەسیری خاوەنی رایەکەی بێدەنگ بوو، چونکە نەیویست ناکۆکی بکەوێتە نێوان خۆی و قایماز کە هێشتا خاوەنی رایە لەموسڵدا(٣).

لێرەدا موجاهیدەددین قایماز لەسەر رایەکەی خۆی موکوڕ بوو و دەستی لێ بەرنەدا. وە لەبەر ئەوەی ئەوکات دەسەڵاتی هەبوو، هەموو قایلبوون، لەوانەش میری موسڵ عیزەددین مەسعوود. ئەوجا نامە گۆڕینەوە

لەنێوان موسڵ و میرانی دەوروپشت، بەپێی ئەو پلانەی بۆی دانرابوو، دەستی پێکرد. ئەو نامەگۆڕینەوانە ماوەیەکی درێژی خایاند، بەبێ ئەوەی سوودێکی هەبێ، چونکە هیچ یەکێک لەوانە بەدەمیەوە نەهاتن بۆ شەڕکردن لەتەک هێزەکانی موسڵ بێجگە لەعیمادەددینی میری شەنگال(٤).

پاشان رووداوەکان لەموسڵ، دوای نەخۆشکەوتنی عیزەددین مەسعوود، لەوکاتەی کە فەرماندەیی هێزەکانی دەکرد کە شەڕیان لەگەڵ سوپای ئەیووبیەکاندا دەکرد لە (تەل مۆزن)پەرەیان سەند، چونکە عیمادەددین زەنگیی دووەمی برای، دوای خۆی فەرماندەییی هێزە جەنگاوەرەکانی موسڵی گرتە دەست(٥).

---

**پەراوێزەکانی(٧):**

١-ابن الاثیر: الباهر ص١٨٥
ابن واصل: مفرج الكروب ج٣ ص١٧
٢-ابن الاثیر: الباهر ص١٨٥
ابن واصل: مفرج الكروب ج٣ ص١٧
٣-ابن الاثیر: الباهر ص١٨٥
٤-ابن الاثیر: الكامل ج١٢ ص١٠٠-١٠١
٥-ابن الاثیر: الكامل ج١٢ ص١٠١ الباهر ص١٨٦ ويختلف زمن الوفاة ففي الكامل ٢٩ شعبان وفي الباهر ٢٧ شعبان.

(٨)

## ڕۆڵی قایماز لەپێدانی ئیمارەتی موسڵ بە نورەددین ئەرسەلان شا:

لەکاتـی نەخۆشکەوتنیدا عیزەددیـن مەسـعوود وەسیەتێکی نووسـی کـە تێیـدا فەرمانـی دابـوو لـەدوای خۆیـدا نوورەددیـن ئەرسەلانشـای کـوڕی فەرمانڕەوایەتیەکـەی وەربگـرێ. ئـەوەش بەهاندانـی موجاهیدەددیـن قایمـازی یـاوەری بـوو(١). بـەڵام کاروبـارەکان لەموسـڵ بـەو ڕێچکەیـەدا نەڕۆیشـتن کـە دەیانویست، چونکـە کاتێـک کـە عیزەددینـی نەخـۆش گەیشـتە موسـڵ، برایەکانـی بۆیـان نووسـی کـە ئـەوان لەجیاتـی نوورەددینـی کـوڕی، داوای جێگرتنـەوەی دەکـەن. دایکـی عیزەددیـن مەسـعوود دەسـتی لـەوە وەردا و بـۆی نووسـی کـە پێـی خۆشـە شـەرەفەددینی بـرای دابنـێ. ئـەو ژنـە چاوەڕێـی وەڵامـی کوڕەکـەی نەکـرد، بەڵکـو ئەوەنـدەی توانـی سـوپای کۆکـردەوەو دەسـتی کـردە هەڕەشـەکردن لەعیزەددیـن مەسـعوودی نەخـۆش و تۆڵەکردنـەوە، ئەگـەر بـەدەم داوایەکـەی برایەکـەی نەچـێ. کار گەیشـت ئـەوەی شـەرەفەددین هەڕەشـەی لەهەمـووان کـرد و گوتـی: «کـەس ناتوانـێ لەگەڵیـدا موسـڵ دابـەش بـکا» چونکـە وای دەزانـی کاروبـارەکان لەبەرژەوەندیـی ئـەون و بـۆ خـۆی دەبـن، بۆیـە نەخۆشـکەوتنی برایەکـەی قۆسـتەوە(٢).

ئـەوکات نوورەددیـن ئەرسـەلان شـا تەمەنـی ٢٠ سـاڵ بـوو و

لەبەر ئەوەی لەکاروباری فەرمانڕەواییی نەدەزانی، پێی وابوو بەئاسانی تای تەرازووەکە بەلای شەرەفەددینی مامی دا دەشکێتەوەو ئەویش بەهێز فەرمانڕەوایەتیەکەی لەدەست دەدا. ئەمە وای لێکرد خۆی بگنخێنێ و خۆی لەهیچ شتێک هەلنەقورتێنێ کە کاروبارەکە بۆ بەرژەوەندیی ئەو ببا(٣).

پەرۆشیی شەرەفەددین و جوولانەوەکەی بۆ وەرگرتنی فەرمانڕەوایەتی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پاشای دادپەروەری ئەیووبی لەنوسێبین دابەزیبوو بۆ ئەوەی بەرەوڕووی هێزەکانی موسڵ و هاوپەیمانەکانیان، بەسەرکردایەتیی عیمادەددین زەنگیی دووەم، ببێتەوەو شەرەفەددینیش رایگەیاندبوو کە دەچێتە پاڵ دادپەروەر (العادل) ئەگەر بەدەم داواکاریەکانیەوە نەیەن، سەرباری ئەوەی کە لەنورەددین ئەرسەلان شاش گەورەترە(٤).

بۆ راستی، موجاهیدەددین قایماز هەتا ئەوکاتیش دوودڵ بوو و بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە بۆ لای شەرەفەددین یان نوورەددین نەبزووتبوو، ئەوەش عیزەددینی نەخۆشی بێزار کردبوو و وای لێکردبوو کە بەپەلەبێ بۆ سوێنددانی خەڵک بۆ نوورەددین ئەرسەلان شای کوڕی و گوێی بەوە نەدا کە لەلای دایکی و برایەکەیەوە روویاندا و پێی گوت: (دەترسێم بمرم و ئێوەش موڵکێکتان نەبێ سەربەخۆ و دوور لەشا و دادپەروەربێ لەوڵاتدا و زیانێکی ئەوتۆ بکەن کە نەتوانن خۆتانی لێ بپارێزن)(٥).

بەلام موجاهیدەددین قایماز بەخێرایی بەدەم ئەو قسەیەوە نەچوو، چونکە لەفیتنەیەک دەترسا، لەبەر ئەوەی لەو بڕوایەدا بوو کە شەرەفەددین ئامادەیە هێز بەکاربێنێ و ئەویش لەو قۆناغەدا ئاشتیی پێ لەپێشترە. پاشان ئەو دەیویست کێشەکە بەڕێگەچارەی ئاشتیانە یەکلایی بکاتەوەو بۆ شەرەفەددینی نووسی و داوای لێکرد کە سوێند بۆ برازایەکەی بخوا و بچێتە ژێر رکێفی ئەو و پەیمانیشی دایێ کە گەرەنتیی زێدەکردنی دابڕاوەکانی بۆ دەکا، بەلام شەرەفەددین بەدەم ئەو ئامۆژگاریەیەوە نەچوو و دەستی کردە هەڕەشە و گوڕەشە لەقایماز و عیزەددین و نوورەددین. ئەمە بووە هۆی ئەوەی موجاهیدەددین ناچار بێ بۆ راگرتنی کرداری سوێندان بۆ شەرەفەددین(٦).

نوورەددین لەبەرامبەر رووداوەکان دەستەوەستان نەما، بەڵکو لەو کاتەدا بۆ مەجدەددین بن ئەسیری راوێژکاری ئیمارەتی نووسیو لەلای قایماز بای لەکەوڵی کرد بۆ ئەوەی دەستێکی تێوەردا بۆ خێراکردنی کرداری سوێنددانەکە و یەکلاکردنەوەی کاروبارەکە بەلای خۆی و بەپەلە(٧). وە بۆ ئەوەی تانی لێبدا بۆ بەردەوام بوون لەسەر ئەو کارە، ئەنگوستیلەکەی خۆی بۆ نارد و ئیبن ئەسیریش ئەنگوستیلەکەی بۆ ناردەوە و پێی گوت(٨): (ئەنگوستیلەی گەورەمان لەسەر ولات دەدرێتێ، ئەو کارە سووک و سانەیە زۆر لەوە پووچترە کە ئەنگوستیلەی

لەسەر وەربگیرێ، چونکە ئەوەی من نەخشەم بۆ داناوە لەناوقەدەوە پێیەوە بەستراومەتەوەو بڕوا ناکەم گەورەمان لەسەر ئەوە سوپاسمان بکا).

گرنگ ئەوەیە کە مەجدەددین ئامادەیی خۆی نیشاندا بۆ کارکردن لەبەرژەوەندیی نوورەددین و خۆی بەسەربازێک دانا لەخزمەت خۆی و باوکە نەخۆشەکەی و چووە لای موجاهیدەددین قایماز و لەگەڵی کۆبۆوەو هانی دا بۆ ئەوەی پەلە بکا و هەڵوێستی یەکلابکاتەوە لەبەرژەوەندیی نوورەددین ئەرسەلان شا و گوتی(٩): (ئەوە شەرەفەددینە و فیتنەی دەوێ، عیزەددینی گەورەشمان کوڕەکەی خۆی دەوێ و دادپەروەریش لەنوسێبینە و فیتنەش سەری قووت کردۆتەوە).

لەو کاتەی کە ئەوان خەریکی تاوتووکردنی ئەو کارانە بوون، نێردراوی عیزەددین مەسعوود بۆ لای موجاهیدەددین قایماز، پەیدا بوو و پێی راگەیاند کە گەورەی زۆر لەو بەرەڵلاییە و هەڵوێستە پڕ شەرمەزاریەکەی بێزارە کە تێیدا وەستاوەو دەبێ زۆر بەخێرایی خەڵک سوێند بدا بۆ نوورەددین ئەرسەلان، هەروەها لەسەریەتی چیدی خۆی نەگنخێنێ، چونکە هەڵوێستەکە بەری دواخستن ناگرێ و نێردراوەکە لەسەر زمانی عیزەددین گوتی(١٠): (زۆر بێزاربووم ئەوەندەی پێت بڵێم خەڵک سوێند بدە بۆ کوڕەکەم و تۆش پشتگوێی دەخەی و دوژمنیش لەنزیکتانە و ئێوەش بێ سەروەرن(سوڵتانن) و منیش

وەکـو بـۆی دەچـم تەنیـا چەنـد رۆژێکـی دیکـە دەژیـم، ئیـدی چاوەڕێـی چـی دەکـەن).

دوای ئـەوەی موجاهیدەددیـن لەمەبەسـتی عیزەددیـن گەیشـت، بەئامادەبوونـی نێردراوەکـەی دەسـتی کـردە گلەییکـردن لەپێـش ئیبـن ئەسـیر، لـەوەی کـە بەسـەری هاتووە، بـەڵام ئـەو هانـی دا کە دەبێ دەسـەڵات و شـارەزاییی سیاسـیی خـۆی بەکاربێنـێ، لەتـەک نوورەددینـدا، چونکـە خـۆی مەیلـی لـەو بـوو. پاشـان ئیبـن ئەسـیر دەسـتی کـردە روونکردنـەوەی ئاسـانیی راگرتنـی، بەبەکارهێنانـی هێـز لەبەرامبـەر شـەرەفەددین، ئەگـەر ویسـتی ئـەو هەڵـە بقۆزێتـەوەو لـەدژی نوورەددیـن بجوولێتـەوە. پاشـان کـردەی دواکەوتـن لەبەرژەوەندیـی نوورەددیـن نیـە، بەقـەد ئـەوەی لەبەرژەوەندیـی شـەرەفەددینە، چونکـە خەڵـک وا تەماشـای دواکەوتنەکـە دەکـەن کـە کەموکورتیەکـە لەلایـەن نوورەددیـن خۆیەوەیـە(١١).

لێـرەدا قایمـاز دڵنیابـوو کـە دەبـێ خێـرا کارێکـی تونـد ئەنجـام بـدا، بۆیـە بـۆ میـر و خـاوەن پۆسـتە بـاڵاکان و پیاوماقووڵانـی وڵاتـی نووسـی بـۆ ئـەوەی بـۆ نورەددیـن ئەرسـەلان شـا سـوێند بدرێـن و ئەوانیـش پەیمانـی کورسـیی دەسـەڵاتیان بـۆ راگەیانـد و دوای ئەوانیـش هەمـوو چینەکانـی کۆمەڵـگا وەکـو پیـر و ناسـراوانی بـازاڕ و هیدیکـەش بـەدوای ئەوانـدا چـوون(١٢).

لەبەرامبـەر ئـەو کارە تونـدەدا، هاوەڵانـی شـەرەفەددین

لێــی تەکینــەوەو ئەویــش ناچاربــوو بــۆ موجاهیدەددیــن بنێــرێ و گلەییــی لێبــکا بــۆ ئــەو شــەرمەزارکردنەی و پشــتیووانی نەکردنــی. وەڵامدانــەوەی قایمازیــش بــۆی، ئـەوە بـوو کـە لـەو کارەیدا مەبەستی خزمەتکردنـی رەوشـی هەمـوو زەنگیـەکان بـووە، بـۆ پاراسـتنی یـەک دەنگـی و یـەک ریـزی و لەسـەر شـەرەفەددینیش پێویسـتە پشـتگیریی ئـەو هەنـگاوە پیـرۆزە بـکا ومتمانـە بەنوورەددیـن بـدا(١٣).

قایمــاز دوای ئــەوە نوورەددینــی ســوارکرد و لەگەڵیــدا بەکەژاوەیـەک بـەرەو لای باوکـی نەخۆشـی رۆیـی و (سـنجەق) (١٤)ی لەســەر ســەری خــۆی هەڵگــرت. قایمــاز لەگەڵــی بەپێیــان دەڕۆیــی و (غاشـیە)ی(١٥) هەڵگرتبـوو. عیزەددیــن بــەو کارە زۆر دڵخــۆش بــوو، بــەڵام مــەرگ بــواری نــەدا بەرەکــەی برنێتــەوەو چــاوی بەفەرمانڕەواییــی کوڕەکــەی بگەشــێتەوەو هــەر دوای دوو رۆژان لەهەڵبژاردنەکــەی، مـرد. بـەم شـێوەیە نوورەددیـن بـووە میـری موسـڵ و هیـچ شـتێک ئارامیـی ئـەو بۆنەیـەی نەشـێواند. قایمـاز بـەردەوام لەســەرەتای حوکمڕانیەکــەی کاروبارەکانــی بەڕێــوە دەبــرد تــا لەســاڵی ٥٩٦ک/١١٩٨–١١٩ز خــودا بــۆ خــۆی بــردەوە.

**پەراوێزەکانی(٨):**

١–ابن الاثير: الباهر ص١٨٩

٢–ابن الاثير: الباهر ص١٨٩

٣–ابن الاثير: الباهر ص١٨٩

٤–ابن الاثير: الباهر ص١٨٩

٥–ابن الاثير: الباهر ص١٩٠

٦–ابن الاثير: الباهر ص١٩٠

٧–ابن الاثير: الباهر ص١٩٠

٨–ابن الاثير: الباهر ص١٩٠

٩–ابن الاثير: الباهر ص١٩٠ والعادل الايوبي الطامع في الموصل موجود في نصيبين واعمالها.

١٠–ابن الاثير: الباهر ص١٩٠

١١–ابن الاثير: الباهر ص١٩٠

١٢–ابن الاثير: الباهر ص١٩٠

العمري: منهل الاولياء تحقيق ونشر سعيد الديوةجي مطبعة الجمهورية الموصل عام ١٣٨٦هـ/١٩٦٧م ص١١٩.

١٣–ابن الاثير: الباهر ص١٩٠–١٩١

١٤–ئاڵایەکی زەردە و بەرزکردنەوەی ئەو (سنجەقە) لەسەر سەر بووە نەریت لەڕۆژانی سەیفەددین غازیی یەکەمی ئەتابەگی موسڵ و ببووە مەراسیمی پاشا لەمیسری ئەیووبی و مەمالیک. الشيال: حاشية مفرج الكروب ١/١١٧.

١٥–الغاشية: زینێک بوو لەپێست بەزێڕ چنرابوو ئەوەی بیبینیبا وای دەزانی لەزێڕ دروست کراوە لەنێوان دەستەکانی سوڵتان هەڵدەگیرا لەکاتی سواربوونی و لەئاهەنگەکان و جەژن و لەگۆڕەپانەکان یەکێک لەسوارەکان وەکو ئاڵایەک هەڵیدەگرت و بەملا و ئەولایدا دەهێناو دەبرد. القلقشندي: صبح الاعشى ٧/٤.

## (٩)

## ڕۆڵی موجاهیدەددین قایماز لەکاتی بەرگریکردن لەبەرژەوەندیەکانی موسڵ لەسەردەمی نورەددین ئەرسەلان شا:

قایماز بەردەوام وەکو جێگری نورەددین ئەرسەلان شا ئاراستەی سیاسەتی لەموسڵ لەدەست بوو، تا ئەوەندەی لەژیانیدا مابوو. بەهەموو ئەو هێزە ماددی و سەربازی و دیپلۆماسیەی کە هەیبوو بەرەنگاری دوژمنە چاچنۆکەکان دەبۆوە. وا ڕێککەوت لەساڵی ٥٩٤ ک/ ١١٩٧-١١٩٨ز. نوورەددین دەستی بەسەر نوسێبین داگرت کاتێک کە لەژێردەستی قوتبەددین محەمەدی کوڕی مامی بوو.

هۆکاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە عیمادەددین زەنگیی دووەمی باوکی قوتبەددین محەمەد کۆنترۆڵی نوسێبینی کردبوو و وا ڕێککەوتبوو کە دەستوپێوەندەکانی دەستدرێژیان کردبووە سەر هەندێک گوند کە سەر بەموڵکایەتیی موسڵ بوون. کاتێک کە ئەو هەواڵە دەگاتە موجاهیدەددین قایماز، بەنهێنیی هێشتبۆوەو نەیویستبوو نورەددینی پێ بێزار بکا، بۆیە نەیدرکاندبوو. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە موجاهیدەددین دەیزانی چەندە نورەددین بەسرووشت توندە و لەم جۆرە هەڵوێستانەدا بێ ئارامە. ئەمە لەلایەک، لەلایەکی دیکەوە، قایماز خۆی زۆر مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی کە هیچ ناکۆکیەک لەنێوان موسڵ و نوسێبیندا هەبێ، واتە لەنێوان نورەددین و عیمادەددین زەنگیدا(١).

لەهەمـان کاتـدا قایمـاز چاکردنـەوەی کاروبارەکانـی گرتـە ئەسـتۆی خـۆی، بۆیـە نوێنەرێکـی خـۆی بـۆ عیمادەددیـن زەنگـی نـارد کـە پێـی بڵـێ دەسـتوپێوەندەکانی کارێکـی ناشـیرینیان کـردووە و پێـی رابگەیەنـێ کـە قایمـاز لـەو کارەدا لەسـەر بەرپرسیارەتیی خـۆی و بەنهێنیـی نورەددیـن ئەرەسـەلان شـا، رەفتـاری کـردووە، چونکـە ئەگـەر ئـەو راسـتیی کارەکـەی زانیبـا، لەوانەبـوو کارێکـی وا بـکا کـە ئاکامەکـەی بـاش نەبـێ، ئەوکاتیـش نـەک هـەر قایمـاز، بەڵکـو هیدیکـەش نەیاندەتووانـی چاکـی بکەنـەوە(٢).

بـەڵام عیمادەددیـن زەنگـی بەجۆرێـک وەڵامـی دایـەوە کـە قایمـازی بێئومێـد کـرد لـەوەی ئـەم کێشـەیە بەئاشـتی چارەسـەر بـکا و لەهەمـان کاتیشـدا بەشـێوەیەک تـوورەی کـرد کـە ناچـار بـوو هەواڵەکـە بگەیەنێتـە نورەددیـن. پێشـتر عیمادەددیـن گوتبـووی کە(دەسـتوپێوەندەکانی) هـەر بەفەرمانـی خـۆی ئـەو کارەیـان کـردووەو ئـەو گوندانـە سـەر بـە نوسـێبینن(٣).

لەگـەڵ ئەوانەشـدا، قایمـاز هیـچ بـێ ئومێـد نەبـوو و بـۆ جـاری دووەم رێگـەی چارەسـەریی دیپلۆماسیانەی گرتەبـەر و نوێنـەری نـاردەوە لای عیمادەددیـن زەنگـی، بـەڵام بـێ سوود بـوو. لێرەدا قایمـاز دەستی کـردە هاندانـی نورەددین بـۆ دەسـتوەردانێکی خێـرا و یەکلاییکردنـەوەی هەڵوێسـتەکە بـۆ بەرژەوەندیـی خـۆی، لەترسـی ئـەوەی نەبـادا میرەکانـی دیکـە چاویـان لەموڵکەکانـی موسـڵ چڕکەنـەوە.

نورەددینیش لەلای خۆیەوە رووی کردە ریوشوێنی دیپلۆماسیانە و پێش ئەوەی ئارامی لێ هەڵگیرێ، نامەبەرێکی ناردە لای عیمادەددین زەنگیی دووەم، بەڵام بێ سوود بوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە عیمادەددین ئەو دووبارە ناردنەوەی نوێنەرانی لەلایەن قایماز و نورەددینەوە بەوە لێکدایەوە کە یەک واتای هەیە، ئەویش لاوازیی سەربازیی موسڵە و توانای بەکارهێنانی هێزی نیە، بۆیە وای لێکرد کە شێوازێکی توند لەو باریەوە بگرێتە بەر. بەرادەیەک زێدەڕۆیی کرد، کە گەیشتە ئەوەی دەست لەنێردراوی نورەددین بەرزکاتەوەو بەخراپ باسی خۆی و گەورەکەشی بکا. لەبەرامبەر ئەو هەڵوێستەدا نورەددین رووی کردە دانانی پلانێکی بوێرانە کە لەڕێیەوەنوسێبین وەکو هێزێک بکەوێنێ و بیخاتە ژێر کۆنترۆڵی موسڵ و سەروەریەکەی.

ئاوابوو کە عیمادەددین زەنگیی دووەم مرد و ئیمارەتەکەی بۆ کوڕەکەی قوتبەددین محەمەد بەجێما، ئەوەش پاڵی بەنورەددینەوە نا پەلە بکا لە رووبەڕبوونەوەی و ئەو بارودۆخە نوێیە بقۆزێتەوە.

بەڵام لێرە قایماز هاتە ناو بابەتەکەوەو داوای لێکرد لەگەڵی نەکەوێتە شەڕەوە لەبەر پاراستنی یەکێتی و بۆ راکێشانی دڵی ئەو میرە نوێیە لەپێش چاوی خەڵکی دیکە. بەڵام نورەددین داوایەکەی رەتکردەوە و بەردەوام بوو لەسەر جێبەجێکردنی پلانەکەی و بەسەرکردایەتیی

هێزێـک بـەرەو نوسـێبین کەوتـە رێ.

کاتێک کە قوتبەددیـن محەمـەد بەمـەی زانـی کـە نورەددین لەڕێگایــە بــەرەو نوســێبین، کاتێــک کــە ئــەو لەشــەنگال بوو، بۆیـە خێـرا گەڕایـەوە نوسێبین و ژمارەیـەک ڕێکاری بەرگریکردنـــی گرتەبـــەر، بـــەڵام لەبەرامبـــەر نورەددینـــدا ســـەرنەکەوت و کۆنترۆڵـــی شـــارەکەی کـــرد و ســـەرلەنوێ بەســـەروەریی موسـڵی لکانـدەوە(٤).

بـــەڵام هێزەکانـــی موســـڵ ســـوودیان لـــەو ســـەرکەوتنە و کۆنترۆڵکردنـــی نوســـێبین و ناوچەکـــە وەرنەگـــرت، بـــۆ ماوەیەکـــی درێـــژ، بەڵکـــو لەڕەمەزانـــی ســـاڵی ٥٩٤ک گەڕانـــەوە بـــۆ موســـڵ، بەبـــێ ئـــەوەی بتوانـــن بەرهەمـــی ســـەرکەوتنەکەیان بڕنێنـــەوە. لەوانەیـــە هـــۆکاری ئـــەوە، بەپلـــەی یەکـــەم، بگەڕێتـــەوە بـــۆ دەرکەوتنـــی ئەیووبیـــی دادپـــەروەر لەوڵاتانـــی جەزیـــرەی نزیـــک نوســـێبین. ئەمـــە و ســـەرباری ئـــەوەی کـــە هێزەکانـــی موســـڵ تووشـــی نەخۆشـــی و کارەســـات هاتـــن لەکاتـــی هاتنیـــان، ئـــەوەش هەلـــی بـــۆ قوتبەددیـن محەمـەد ڕەخسـاند و وای لێکـرد لەموسڵ یاخـی بـــێ و جارێکـــی دیکـــە شـــارەکەی وەربگرێتـــەوە(٥).

---

**پەراوێزەکانی(٩):**

١–ابن الاثیر: الکامل ج١٢ ص١٣٣.
٢–ابن الاثیر: الکامل ج١٢ ص١٣٣.
٣–ابن الاثیر: الکامل ج١٢ ص١٣٣.
٤–ابن الاثیر: الکامل ج١٢ ص١٣٣.
٥–ابن الاثیر: الکامل ج١٢ ص١٣٣.

(١٠)

## دەستکەوتەکانی موجاهیدەددین قایماز:

گومانــی تێــدا نیــە کــە کەســایەتیی تــاک، بەشــێوەیەکی گــەورە، دەســتکەوتەکانی دیــاری دەکا. ئەگــەر کەســایەتیەکە خێرەومەنــد بــوو و حــەزی لەئاوەدانکردنــەوە بــوو و بــۆ ژیــان کــراوە بــوو و کەمێــک لەسیاســەتی دەزانــی، ئــەوا دەتوانــێ دەســتکەوتی شارســتانیی گــەورە ئەنجــام بــدا.

هــەر لــەو جــۆرە پیاوانــە، موجاهیدەددیــن قایمــازی نوێنــەری موســڵ بــوو. ســەرچاوە بەردەســتەکان دەگێڕنــەوە کــە کەســایەتیەک بــووە بڕێکــی زۆر لەکراوەییــی سیاســیانەی تێــدا بــووەو حــەزی لەخێرکــردن و خۆشــبەختیی کۆمەڵــگا بــووە. ئیبــن ئەســیر(١) بــەوە باســی دەکا: (هۆشــمەند و ئاییــندار و خێرەومەنــد و پایەبــەرز بــووەو زانســتی شــەرعی لەمەزهەبــی ئەبــی حەنیفــە، خــوا لێــی خۆشــبی، زانیــووە). وە ئیبــن ئەلســاعی(٢) بــەوە ئامــاژەی بــۆ دەکا: (هۆشــمەند و بــڕوادار و خێرەومەنــد و پایەبــەرز بــوو و شــتێکی لەزانســتی شــەریعەتی شــافیعی دەزانــی و شــیعر و دیــدار و چیرۆکێکــی زۆری لەبــەر بــوو. زۆر بــەڕۆژوو دەبــوو). ئیبــن کەســیریش(٣) دەڵــێ: (بــڕوادار و خێرەومەنــد بــوو، لەســەر مەزهەبــی حەنەفــی بــوو، زۆر بــەڕۆژوو دەبــوو و شــەونوێژی دەکــرد و ئــەدەب و شــیعر و زانســتی شــەریعەتی دەخوێنــدەوە).

ئیبــن خەلەکانیــش(٤) دەگێڕێتــەوە: (زۆر خێــر و چاکــەی دەکــرد و زۆر باڵەخانــەی لــە ئەربــل و موســڵ و شــوێنی

